میرزا شکرالله سنندجی "فخر الکتاب"

# هۆز و تیرە و تایفەی کورد لە کوردستانی ئێراندا



وەرگێڕان، ئامادەکردن و

سەرەتاو پەراوێز بۆ نووسینی

ئەنوەری سوڵتانی



# هۆز و تیره و تایفەی کورد
# لە کوردستانی ئەردەڵان

( وەرگێڕاوی کوردی و دەقی فارسیی
دەستنووسێکی سەدەی نۆزدەهەم )

نووسینی
**میرزا شکراللە سنندجی "فخر الکتاب" ؟**

ئامادەکردن، وەرگێڕان و
سەرەتاو پەراوێز بۆ نووسینی
**ئەنوەری سوڵتانی**

بنکەی ژین
سلێمانی ٢٠٠٦

٩٢٩,١٠٥٥٥٤
ف ٧٢٢ فخرالكتاب سنندجي، ميرزا شكرالله؟
هۆز و تیره و تایفەی کورد لە کوردستانی ئەردەڵان/ لە فارسییەوە وەرگێڕانی ئەنوەری سوڵتانی.-سلێمانی: بنکەی ژین.
٢٠٤ل، (١٤,٨٥ × ٢١ سم).
١-ئەردەڵان-هۆز ٢-هۆزو تیرەو تایفە کوردیەکان ٣-کوردستانی ئێران-مێژوو
ئ-سوڵتانی، ئەنوەر (وەرگێڕ) ب- ناونیشان
کتێبخانەی گشتیی سلێمانی زانیاریی سەرەتایی پێڕست و پۆلێنی ئامادە کردووە

سەرپەرشتی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق ساڵح

زنجیرە: ٣٩
کتێب: هۆز و تیره و تایفەی کورد لە کوردستانی ئەردەڵان (وەرگێڕاوی کوردیو دەقی فارسیی دەستنووسێکی سەدەی نۆزدەهەم)
نووسەر: میرزا شکرالله سنندجي "فخرالكتاب"؟
وەرگێڕو ئامادەکەر: ئەنوەری سوڵتانی
تایپ: سوبحییە نادر، خانی هەژار
مۆنتاج: سەرکەوت مەحموود
بەرگسازی: قادر میرخان
خەتی بەرگ: ئەحمەد سەعید
تیراژ: ٧٥٠
شوێنی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی شڤان
ژمارەی سپاردن: ٤٧١ی ساڵی ٢٠٠٦

لە بڵاوکراوەکانی
بنکەی ژین
بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی
هەرێمی کوردستانی عیراق- سلێمانی. گەڕەکی ١٠٤ ئاشتی ، کۆڵانی٣٩، خانووی ژمارە ١٠،
( بەرامبەر بە قوتابخانەی سەرەتایی ئەردەڵان )
تەلەفۆن: ٣١٢٣١٠٥ مۆبایل: ٠٧٧٠١٤٨٤٦٣٣ یان ٠٧٧٠١٥٦٥٨٦٤ ژمارەی سنووقی پۆست: ١٤
E.mail: bnkaizhin@yahoo.com

**بۆ یادی:**

میرزا شکرالله سنندجی - فخر الکتاب،

میرزا عەلی ئەکبەری وەقایع نیگار، و

جەلادەت عالی و رەوشەن بەدرخان

**پێشکەش بە:**

کاک محمد رەئووف تەوەککولی بانەیی و کاک سید محمد سەمەدی کە پێش من ئەرکی نووسین، ناساندن و بڵاوکردنەوەی ئەم دەستووسەیان ڕاپەراندوە،

هەروەها کاک فەرهاد شاکەلی خاوەنی ئێستای دەستنووسەکە، کە بێدرێخ یارمەتی ئامادەکردن و چاپی کتێبەکەی داوە.

**ئەنوەر**

# پێڕست

(٦) ئیناقی [ئیناخی]
(٧) ئێله رووته
(٨) ئەورەحمان بەگی:
مستەفایی، دوورودیی،بەیانی و بێ سەری
(٩) نیمامی

**مەتڵەبی دووهەم - پیتی ب:**
(١) باوەجانی
(٢) بەراز
(٣) بەلیلوەند [بەلیلەوەند]
(٤) بۆرەکەیی

**مەتڵەبی سێهەم - پیتی ت:**
(١) تایجۆزی [تاوگوێزی]
(٢) تاری مرادی
(٣) تیکلو [تیلەکۆ]

**مەتڵەبی چوارەم - پیتی د:**
(١) دوڕاجی
(٢) دۆم

**مەتڵەبی پێنجەم - پیتی ز:**
(١) زەردوویی
(٢) زەندییە

**مەتڵەبی شەشەم - پیتی س:**
(١) سونقوڕ

(٢) سوور سوور

مەتەڵی حەوتەم - پیتی ش:

(١) شاه قوبادی

(٢) شاه مەنسووری

(٣) شێخ ئیسماعیلی

مەتەڵی هەشتەم - پیتی ق:

(١) قالقالی

(٢) قوبادی

(٣) قەشە

مەتەڵی نۆهەم - پیتی ک (و گ):

(١) کورکەیی

(٢) گەشکی

(٣) کەلاش

(٤) گەڵباخی

(٥) کەلهور

(٦) گۆران

(٧) کویک [کویک؟]

(٨)کۆماسی

(٩) کوکویی

(١٠) کۆسە

مەتەڵی یازدەهەم - پیتی ل:

(١١) لاله

(١٢) لەک

**مەتڵەبی دوازدەهەم - پیتی م:**

(١) مصطفی بەگی

(٢) مەنووچیهری

(٣)مەندەمی:

محمد مرادی

تاری مرادی

**مەتڵەبی سیزدەهەم - پیتی ن:**

(١) نەدری

**مەتڵەبی چواردەهەم - پیتی و:**

(١) وەڵەدبەگی

---

تێبینی:

ئەم پێرستە لەدەقی دەستنوسەکەدا نییە و من بۆم ئامادەکردوە.

**ئەنوەر**

# سەرەتای وەرگێڕ

زۆربەی ئەو بابەتانەی لەسەر مێژووی ناوچەی سنە نووسراون، تایبەت بە باسی بنەماڵەی ئەردەڵانییەکانن (مێژووی مەستوورە، مێژووی خوسرەوکوڕی محمد کوڕی مەنوچیهر). تاك و تەراش ئەگەر توانیبێتیان لەو جوغزە بێنە دەرێ، گرنگی سەرەکییان هەر بەمەسەلەی ئەردەڵانییەکان داوە و هەموو باسێکی تریان لەمەڕ هۆز و بنەماڵە و شار و مەڵبەندی دیکەی ناوچە و باری کۆمەڵایەتی و ئابووری و کولتووریی ژیانی خەڵك، بە کورتی بڕیوەتەوە (زبدە التواریخ، تحفە ناصری، حدیقە ناصری).

لە ئاکامدا، ئێمە ئەمڕۆ ژمارەیەکی بەرچاوی مێژووی هەمەچەشنەی ئەردەڵانمان لەبەر دەستدایە کە زۆربەیان دووپات کراوی بەسەرهاتی خانانی ئەردەڵان و شەڕ و گەڕیانە لەگەڵ زەند و زەنگەنە و بڵباس و بابان،

لەکاتێکدا ژیانی کۆمەڵایەتی ناوچەکە و تەنانەت دانیشتوانی شاری سنەش شاراوە ماوەتەوە و جیا لە چەند ئیشارەی کورت، باسی ئەو تۆیان لێوە نەکراوە.

لەو ڕوانگەیەوە، نامیلەکەیەك کە ئێستا دەکەوێتە بەر دەستی خوێنەر، خاوەنی گرنگایەتی تایبەتە. نووسەر، هەموو لاپەڕەکانی تەرخانی هۆزە کوردەکانی کوردستانی ئەردەڵان کردوە و باری ژیان و هەڵس و کەوت و پێوەندییەکانی عێل و عەشیرەتی کورد، هاوپشتی و خزمایەتی، دووبەرەکی و دوژمنایەتی، شەڕ و نێوان ناخۆشی، ئازایەتی و بەجەرگی، گوێ لەمستی و دارەدەستی بێگانە و هەروەها پیلانی کوردکوژانی ئێرانی لە پێناو بە ئێران کردنی سیستەمی کۆمەڵایەتی هۆزە کوردەکان و هەوڵی دەوڵەتی تورك بۆ بەگژیەکداکردنیانی خستۆتە ڕوو.

نووسەر، بێ ئەوەی وەك مێژوونووسانی کلاسیکی ڕۆژهەڵات، تووشی درێژدادڕی بێت و وشەی رەقی عەرەبی و فارسی بکاتە ناوئاخنی نوسراوەکەی، راستەوخۆ چۆتە سەر ناوەڕۆکی باسەکە و زانیارییەکانی خۆی لەسەر ٥٤ هۆز و تیرە و تایفەی کوردستانی ئەردەڵان (سنە، سەقز، هەوشار، گەڕۆس، جوانڕۆ، هۆبەتوو، مەریوان و هەورامان تا سنووری کرماشان و هەمەدان) ی خستۆتە توێی ٤٩

لاپەڕەوە کە سەرجەم لە ٩٧٠ دێڕ و دەهەزار وشە تێپەڕ ناکات.

بەداخەوە، نوسراوەکە لەمەڕ ناوی نووسەر و نوسخە هەڵگر و تاریخی نوسران و تەنانەت عینوانەکەی خۆی بێ دەنگە و هیچکام لەو زانیارییە گرنگانەمان بەدەستەوە نادات. لە نەبوونی ئەو مەعلوماتەشدا، تاقە شتێك ڕووناکی بخاتە سەر پرسیارەکانی ئێمە، ناوەڕۆکی نوسراوەکە خۆی و شی کردنەوەی هەواڵەکان و هەڵسەنگاندنی هەڵوێستەکانی نووسەرە. من لێرەدا هەوڵ دەدەم بەرەو ئەو راستییە شاراوەیە بئاژوێم و بە گوێرەی توانا، وەڵامی ئەم سێ دیاردە نادیارە بدۆزمەوە:

١- تاریخی نوسرانی دەستنووسەکە،

٢- ناوی نووسەر،

٣- ناوی نامیلەکەکە خۆی.

با هەر لێرەدا بڵێم هیچ کام لە بۆچوونەکانی من، تەنانەت بۆ خۆشم، دوایین وەڵام نین و دوا بڕیار لەمەڕ هەرکام لەو پرسیارانە، وا هەیە جیاواز بێت لە دەسکەوتەکانی من.

**١- تەئریخی نووسرانی نامیلکەکە:**

ئـ - نووسـەر دەڵێ نوسـراوەکـەی خـۆی بەگـوێرەی فـەرمـانـی «ناصـر الدین شـاه قـاجار» و «ظل السلطان» ی کـوڕی نووسـیـوە، کـە داوایان لێ کـردبوو «ناوی عـێل و عەشـیـرە و تایفـەی ژێر حـوکمـاتی حـاکـمی کـوردسـتـانی ئێران» بنووسێ و بینـێریێتـە خـزمـەت «صـنیع الدوله» ی وەزیری «انطباعات»(ل ١و٢).

دەزانـین ناصـرالدین شـاه ، کـوڕی مـحـمـد شـاه، چوارەمین شـاهی زنجـیـرەی قـاجـارە (١٢٤٧ تا ١٣١٣ی کـۆچی /١٨٣١ تا ١٨٩٦ی زایێنی)کـە نزیکـەی پەنجـا سـاڵ (١٨٤٨-٩٦)،حوکمی ئێرانی کرد و لە ئەنجامدا، بە دەسـتی «مـیرزا رەزای کرمـانی» موریدی «سـید جمـال الدین اسد ئابادی» کوژرا (١٨٩٦).

مـاوەی دوور و درێژی حکوومـەتی ناصـر الدین شـاهی «صـاحـبـقـران»، کـەڵکی ئەوتۆی بۆ دۆزینەوەی وەڵامی پرسـیـارەکـەی ئێـمـە نابێ، جگە لـەوەی بـیـخـاتـە چوارچێـوەیەکی ٥٠ سـاڵەی نێـوان ١٨٤٨ و ١٨٩٦ەوە، کـە دەشـیخات.

بەڵام بەپێـچـەوانە، ژیان و بەسـەرهاتی کـوڕە ملهوڕەکەی دەتوانێ لەم بوارەدا یارمەتییەکی باشمان بدات و ئاڵقـەی سـەردەممان بۆ بەرتەنگتر بکاتەوە: «مـەسعـوود

میرزای ظل السلطان» له ئازەربایجان دەژیا و له نێوان ساڵانی ١٨٨٢ و ١٨٨٨ دا، کرابوه حاکمی هەمو ناوچه ڕۆژئاواییەکای ئێران بەکوردستان و کرماشان و لۆڕستانەوه. دەرکردنی فەرمان بۆ نوسینی ئەم نامیلکەیەش دەبێ له هەمان ماوەی ساڵانی ١٣٠٠ و ١٣٠٦ك/ ١٨٨٢ و ١٨٨٨ز. دا بووبێت که ناوبراو حکوومەتی کوردستانی به دەست بوه و هەستی به پێداویستی ئەم چەشنه زانیارییانه لەسەر کوردستان و خەڵکەکەی کردوه، زۆریش دوور له ئیحتیات نابێ ئەگەر بڵێین ظل السلطان، فەرمانەکەی له ساڵانی سەرەتای حکوومەتی خۆیدا دەرکردوه. کاتێ که «شاه بابا» تازه کردبوویه حاکمی کوردستان و ئەمیش هیچی لەمەڕ کوردستان نەدەزانی.

ب ـ نووسەر، له باسی هۆزی «تاوگوێزی» دا، کاتێ باسی شاعیری مەزن ـ «مەولەوی تاوەگوێزی» دەکات، دەڵێ: «خوالێخۆش بوو مەلا عەبدالرحیم، ناسراو به مەولەوی، پێش دوو سێ ساڵ کۆچی دوایی کرد.»(لاپەڕه ٢٣).

ئەگەر ساڵی مردنی مەولەوی به ١٣٠٠ ی کۆچی بزانین (دیوانی مەولەوی، چاپی مەلا عبدالکریم مودەڕڕیس؛

تاریخ مشاهیر کرد، نووسینی بابا مردوخ ڕوحانی، ب ۱، ل ٤٦٧)، دووسی ساڵ دواترەکەی، دەکاتە ساڵانی ۱۳۰۲ و ۱۳۰۳.

دەزانین ساڵی ۱۳۰۲ی کۆچی، بەرانبەرە لەگەڵ سێ مانگێ لە ساڵی ۱۸۸۳ و نۆ مانگێ لە ساڵی ۱۸۸٥ی زایینی. ساڵی ۱۳۰۳ش، سێ مانگی ئاخیری ساڵی ۱۸۸٥ و نۆ مانگی ساڵ ۱۸۸٦ دەگرێتەوە. بەم پێیە، نامێلکەکە هەمووی یا بەلای کەمەوە بابەتی پەیوەندیدار بەخێڵی تاوگوێزی، لە نێوان ساڵانی ۱۸۸٤ و ۱۸۸٥ دا نوسراوە. ئەم ساڵانەش، لەگەڵ ساڵانی سەرەتای حکوومەتی «ظل السلطان» لە کوردستاندا یەك دەگرنەوە و بۆ چوونەکەی پێشوومان تەئیید دەکەن.

پ ـ دەمێنێتەوە دیاری کردنی تاریخی وردی نووسینی نامیلکەکە لە نێوان ساڵانی ۱۳۰۲ و ۱۳۰۳کۆچی و ۱۸۸٤ تا ۱۸۸۸ی زایینیدا. لەم قۆناغەی کارەکەدا، بە داخەوە هیچ سەرچاوەیەك ناتوانێ یارمەتیمان بدات و ئەوی بۆمان دەمێنێتەوە، هەندێ ڕووداوی سیاسی ناوچەکەن کە دەبێ بتوانین لەبەر ڕووناکایی ئەواندا مەسەلەکە چارەسەر بکەین:

ئەمان الله خانی دووەم ـ ناسراو بە «غولامشاخان»، دوا خانی بنەماڵەی ئەردەڵانە. ناصر الدینشاه لەپاش

مردنی ئەو (نۆهەمی جمادی الثانی ١٢٨٤ك / هەشتەمی ئۆکتۆبەری ١٨٦٧ز) کۆتایی بە حوکمی ئەردەڵانەکان هێنا (ئەو کارەی وا سوڵتانەکانی عوسمانی پێش بیست ساڵ بەسەر بابانەکانیان هێنابوو) و حکوومەتی کوردستانی دا بە «فەرهاد میرزای معتمد الدوله» ی مامی خۆی.

معتمد الدوله، رۆژی چوارەم یا چواردەهەمی مانگی ذیلقعدەی ١٢٨٤(تحفە ناصری، ل ٢٧٦، تاریخ مردوخ، ل ٤١٥)، بەرانبەر لەگەڵ ٢٨ فیبرەوەری یا هەشتەمی مارچی ١٨٦٨ی زایینی، گەیشتە شاری سنە و لەو کاتەوە، شەوی کورد و رۆژی عەجەم باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشاوە.

ئێرانییەکان، شارەزای کوردستان و شێوەی ژیانی کورد نەبوون و چاویان لە حوکمی نیمچە سەربەخۆی خان و بەگ و سوڵتانە کوردەکان ترسابوو. هەر ئەو ترسەش بوو کە نەیدەهێشت فەرهاد میرزا بێتە کوردستان. ناوبراو، پاش ئەوەی چەند جار لەبەر حوکمی ئەمارەتی کوردستان دەرچوو، تەنیا بە زۆری ناصرالدین شاه رووی کردە ناوچەکە.

درەنگتر، حکوومەتی کوردستان لە ساڵی ١٢٩٨دا، درا بە «ظل السلطان» و ئەویش «مەحمود خانی ناصر الملك قەرە گوێزلوو» ی بە نوێنەرایەتی خۆی ناردە کوردستان. محموود خان لە مانگی ذیلقعدەی ساڵی ١٢٩٨ (سپتەمبر و

ئۆکتۆبری ١٨٨١ی زایینی) دا، گەیشتە سنە و تا مانگی ڕەجەبی ساڵی ١٣٠٠ (مایسی ١٨٨٣ز) لەسەر حوکم مایەوە. (تحفه ناصری، ل ٢-٣٧١) بەڵام حوکمی «ظل السلطان» خۆی تا ساڵی ١٨٨٨ درێژەی کێشا (فرهنگ معین ، ٥).

کاتێ مەسەلەی «دو سێ ساڵ دوای کۆچی دوایی مەولەوی» کە پێشتر باسمان لێوە کرد، دەخەینە پاڵ بۆچوونمان لەمەڕ ساڵانی سەرەتای حکوومەتی ظل السلطان، لە ئەنجامدا وێچووترین تاریخ بۆ نووسرانی نامیلکەکە تا ئێرە، دەبێتە ساڵی ١٨٨٤ بەڵام دوا بڕیار لەسەر ئەم باسە بۆ چەند دێڕ دواتر دەهێڵینەوە.

شایانی باسە کە نامیلکەکە، هەندێ ئیشارەی بۆ چەند کەسایەتیی ناوچە، وەك سەرەك خێڵ و کوێخای سەردەمی نووسرانی یادداشتەکان تێدایە، کەنەبوونی زانیاری لەسەر ژیان و بەسەرهاتیان، ئیجازە نادات کەڵکی پێویستیان بۆ ئەم مەسەلەیە لێ وەربگیرێت. بۆ نموونە، لە باسی هۆزی ئیسماعیل غەدیری دا دەڵێ « هەشتا ساڵ پێش ئێشتا هاتوونە تە خاکی کوردستانی ئێران» یا لە باسی هۆزی باوەجانیدا دەڵێ دەدوازدە ساڵ پێش ئێستا هاتنی ئێرانیان لێ یاساخ کراوە. شوێن هەڵگرتنی ئەم تەئریخانە لەمەڕ ساڵی نووسرانی دەستووسەکە گەلێك متمانەی زیاترمان دەداتێ.

**١- ناوی نووسەر**

ئەگەر دۆزینەوەی مێژووی نووسرانی نامیلکەکە، بە یارمەتی یادداشتەکانی نووسەر و هەندێ بەڵگەنامەی مێژوویی هاتە ئەنجام، ڕوونکردنەوە و دەرخستنی ناوی نووسەر بە پێچەوانەوە، کارێکی نەگونجاو و نامەیسەرە.

نە دەسپێك و نە کۆتایی و نە هیچ شوێنێکی دیکەی نامیلکەکە، دیاردە بەناوی نووسەر ناکەن و لەهەل و مەرجێکی وادا، تەنیا هیوایەك کە بمێنێ سەرهەڵدانی درەنگێ یا زووی نوسخەیەکی دیکەی نامیلکەکە لە قوژبنێکی وڵات یاخود را و بۆچوونی شارەزایەکە، کە بەپێی بەڵگە و سەنەد، پەردە لەسەر ئەو ڕاستییە شاراوەیە هەڵبگرێ.

لە مەڕ ئیمکانی یەکەم، پێویستە بڵێم هەندێ نیشانەی وەك هەڵەی زمان و ڕێنووس بە نوسخەکەوە دیارن کە نیشان دەدەن دەستنووسەکە لەبەر نوسخەیەکی دیکە هەڵگیراوە و نوسخە هەڵگر - کە بەداخەوە ناوی ئەویش هەر ڕوون نییە، هەندێ وشەی بەهەڵە بەرگوێ کەوتوە و هەروا بە هەڵەش نووسیویەتەوە. من لەسەر ئەو باوەڕەم کە بەلای کەمەوە نوسخەیەکی دیکەی نامێلکەکە لە شوێنێکی ئێران هەبوە و دوور نییە تائێستایش هەر لە

جێیەکی وەك سنە یا تاران پارێزرابێت.
سەبارەت بە ئیمکانی دوەمیش پێویستە بڵێم هەوڵێکی زۆرم لەدووی داوە و سەرچاوەیەکی زۆری بە شوێندا گەڕاوم بەڵام شوێنی نووسەرم بۆ هەڵنەگیراوە. لەگەڵ ئەوەشدا، لەکارەکەی خۆم دڵنیا نیم و دووری نازانم لەسەر چاوەیەك دا ناوی پەرتووك و نووسەرەکەی هاتبێ.
لەم بوارەدا، بەڕێز د. ئەمیری حەسنپوور، لیستەی ناوی چەند دەستنووسی وەزارتی دارایی ئێرانی بۆ ناردم کە لێرەدا سپاسی دەکەم. یەك لەو دەستنووسانەی وەزارەتی دارایی واتە ١٤م ب ـ ٢٥٠الف لە «جلد پنجم»، زۆر وا هەیە نوسخەیەکی دیکەی هەر ئەم دەستنوسە بێت، بەڵام بەداخەوە، نێوی نووسەری ئەویش دیاری نەکراوە و تەنیا گوتراوە «نووسەرەکەی پیاوێکی زانا بوە».
هەرچۆنێك بێت، بە دەستەوە نەبوونی سەرچاوە، دەرەتانی دۆزینەوەی راستەقینەی ئەم راستییەی لێ سەندووین و ئەوەی بۆمان مابێتەوە بەراوردکارییەك دەبێ لە نێوان نووسەر و هەندێ دیرۆك نووس و میرزای دیوەخانی ئەردەڵانەکان بەنیازی هەڵسەنگاندنی بارستایی ئینشا و شێوەنووسینی نووسەر و هەروەها شی

کـــردنەوەی هەڵوێست و بۆچوونەکـــانی ئەو بەنـیـــازی بەرانبـــەر دانان لەگـــەڵ نووسین و بۆچوونی ئەدیب و مێژوونووسی دیکەی سەردەمی خۆی.

لەو پەیوەندییـــە و لەرێگەی وردبوونەوە لەناوەڕۆکی دەست نووسـەکـەوە، من گـەیشـتـوومـەتە هەندێ ئاکام، کـە لێرەدا، دەیانخەمە روو:

١- دەرچوونی فـەرمـان لەلایەن ناصـرالدین شـاە و«ظل السلطان»ەوە بۆ نووســەر، نیـشـان دەدەن کـە نووســەر، کەسایەتییەکی ناسراو بوە و کاربەدەستانی حکوومەتی تاران و یەك لەوان «صنیع الدولە»ی وەزیری «انطباعات»، ناسیویانە(یاخود ئەو ناسیونی).

٢- من لە نێو دام ودەزگای حکوومەتی ناصرالدین شا لەتاران، سـۆراغی کـوردێکی نووســەر ناکـەم کـە مـتـمـانە پێکراوی شـاو شـازادە و نـاسـیـاوی صـنیع الدولـە بووبێت. عـزیزخـانی «سرداركل»، ئەهلی قـەڵەم نەبوە، پلـەشی لەوە بەرزتر بوە ئەرکی وای پێ بسپێررێ و نێوانـێکی خۆشی لەگـــەڵ ئەردەلانەکـــانیش نەبوە. ئەوەش هیـچ، دەرباری ناصـری تاوانی لایەنگری لە کـورد و هاندانی بزووتنەوەی کـوردایەتی داوەتە پاڵی و درەنگـتـر لەپـێـتـەخت دووریان خسـتـۆتەوە و ناردوویانەتەوە سـەردەشت و«سـیـسـێـر» و «نستان» ی مسقط الراس.

«عباس میرزای مولك ئارا»- برای ناصرالدین شا، له دایکەوە کورد بوە، بەلاّم ئەویش ناتوانێ ئیحتیمالێکی بەهێز بۆ نووسینی نامیلکەکە بێت. ناوبراو، بۆماوەیەکی دوور و درێژ لەلایەن باوکیەوە کەوتبوە زیندان و مەنفا و هیچ بەڵگەیەك بەدەستەوە نیە پەیوەندێکی لەگەڵ ناوچەی ئەردەلاّندا بوو بێت. پێشتریش لەساڵی ۱۸۸۰دا دیتمان کە کاتێ «شێخ عوبەیدیللای شەمزینی» نامەی پشتگیری بۆ نارد نامەکەی بردە خزمەت «شاه بابا» و بوە هۆی گیران وئیعدام کرانی دوو تەتەرەکەی خەڵکی هەکاری.

بەکورتی، دوور نیە نووسەر تەنانەت کورد نەبووبێت و «مستوفی» یا «محاسب»ێکی عەجەم لەدیوەخانی ئەردەلاّنەکان بووبێت.

۳- ئینشاء و رەبطی نووسەر نیشان دەدەن کە «رووداونوس» یا «کاتب »ێکی خاوەن ئەزموون نەبوە و زیاتر کاربەدەستێکی میری بوە کە ئەرکێکی وەك کۆکردنەوەی باجی کوردستانی پێ ئەسپێررابێت.

٤- لەلایەکی دیکەوە، روانینی ئیجابی بەسەر هۆزە کوردەکاندا، رێزگرتن لە شێخ و مەلا و پیر و پیاوچاکانی سوننی کوردستان و هەروەها لایەنگرتنی «ئەردەلاّنیەکان» و دژایەتی هۆزی رەقیبی ئەردەلاّن - واتە جاف و بابان، وا هەیە بمانگەیێنێتە ئەو باوەڕەی کە نووسەر لە

ئەردەڵانەکان یا سەر بەوان بوە. دوور نییە لە کاتی هەڵوەشانەوەی حوکمی بنەماڵەی ئەردەڵانەوە و تا سەردەمی نووسرانی نامیلکەکە و ماوەیەکیش دوای ئەو، ڕۆحی ئەردەڵانییەکان بەسەر دیوەخانی حاکمانی عەجەمی ناوچەکەدا زاڵ بوو بێت و ئەندامانی بنەماڵەکەش، بەکردەوە لە ئیش و کاری میریدا هەر مابن واتە نووسەر ئەگەر ئەردەڵانیش نەبوو بێت، نەیتوانیوە دژ بەوان بوەستێت.

با لەپێشدا، ئەو ئیمکانە بگرینە بەرچاو کە نووسەر خۆی کورد و خەڵکی ناوچەکەبوە. لە مێژوونووس و میرزا و کاتب و ڕووداونووسی سەردەمی ئەردەڵانەکان، ئێمە ئەم زاتانە دەناسین:

١- مەلا محمد شەریفی قازی ئەردەڵانی، کە «زبدە التواریخ سنندجی» لە ساڵی ١٢١٤ی کۆچی (١٧٩٩-٨٠ز)دا، نووسیوە.

٢- مەلا ابراهیم کوڕی مەلا حوسەینی ئەردەڵانی، کە کورتەمێژوویەکی بنەماڵەی ئەردەڵانی لە ساڵی ١٢٢٥ك/١٨٨٠ز دا، نووسیوە.

٣- خوسرەو کوڕی محمد کوڕی مەنووچیهر، کە مێژووی ئەردەڵان (لب التواریخ)ی لە ساڵی ١٢٤٩ك/٤-١٨٣٣ز دا، نووسیوە.

٤- مەستووورە خانم کچی ئەبولحەسەن بەگ، کە «مێژووی ئەردەڵان» ی لە ساڵ ١٢٦٤ك/ ٨-١٨٤٧ز دا، نووسیوە.

٥- میرزا عبدالله مونشی (ڕەونەق)، کە درێژەی مێژوەکەی مەستووورە خانمی برازای تا مانگی جمادی الاولی ساڵی ١٢٦٧ك/ ٥١-١٨٥٠ز، نووسیوە.

٦- عبدالقادر کوڕی ڕۆستەمی بابانی کە «سیر الاکراد» ی لەمانگی شەشەکانی ساڵی ١٢٨٨ك/٧٢-١٨٧١ز دا، نووسیوە.

٧ و٨- میرزا عەلی ئەکبەری وەقایع نیگار، کە «تاریخ الاکراد» ی لە مانگی ربیع الاولی ساڵی ١٣٠٦ك/ ٩٠-١٨٨٨ز، و «حدیقە ناصری» لە ساڵی ١٣١٩ك/ ٢-١٩٠١ز دا، نووسیوە.

٩- میرزا شکر الله سنندجی (فخرالکتاب)، کە «تحفە ناصری «لە ساڵی ١٣١٩ك/٢-١٩٠١ز دا، نووسیوە و(واهەیە بەهۆی مردنیەوە) بۆی نەهاتۆتە کۆتایی.

لەو نووسەرانە، مەلا محمد شەریفی قازی ومەلا ابراهیم و خوسرەو و مەستووورە، بە حیسابی مانگ و ساڵ نابێ نووسەری نامیلکەکە بن.

دەمێنێتەوە میرزا عبداللەی مونشی (ڕەونەق) و میرزا عەلی ئەکبەر و فخرالکتاب.

میرزا عەبدوڵڵای مونشی (ڕەونەق) نووسەری ئەمان الله خانی دووهەم (١٢٦١ تا ١٢٨٤ك/ ١٨٤٥ تا ١٨٦٧ز)، لە ساڵی ١٢١٨/ ١٨٠٣ دا لە دایك بوە و لە ساڵی ١٢٨١ / ١٨٦٤دا کۆچی دوایی کردوە. نازناوی شاعیریی میرزا عەبدوڵڵا، «ڕەونەق» بووە و کەشکۆڵێکی لە شیعری هۆنەرانی فارسی ویژی ئەردەڵان پێك هێناوە کە بەناوی «ئەمان الله خان»ەوە ناوی «حدیقەی امان اللهی» لەسەر ناوە و لە ئێران چاپ و بڵاو بۆتەوە (تصحیح و تحشیه دکتر ع. خیامپور، موسسه تاریخ و فرهنگ ایران، تبریز، ١٣٤٤ [١٩٦٥]).

میرزا عەبدوڵڵا، باوکی میرزا شکرالله فخرالکتاب (١٢٧٥-١٣٤٠ / ١٨٥٨-٦ تا ٢-١٩٢١) و میرزا عەلی ئەکبەری وەقایع نیگار (لە ساڵی ١٣١٧ / سەرەتای ١٩٠٠ دا کۆچی دوایی کردوە) و مامی مەستوورە خانمی شاعیر (١٢٢٠ تا ١٨٠٥/١٢٦٤)ە. میرزا عبدالباقی «شەیدا» ش، پوورزا و میرزا حسینقلی «حاوی» خوشکەزای «ڕەونەق» بوون (شەیدا لە ساڵی ١٨٢٨/١٢٤٤ز و حاوی لە ساڵ ١٢٦٣ /٨-١٨٤٧ز دا، مردوون). وەك دەبینین، «ڕەونەق» پێش ئەوساڵانە مردوە و ناتوانین گومانی نووسینی نامیلکەکەی لێ بکەین. «شەیدا» و «حاوی» ش، بەهەمان شێوە.

ئەوی بمێنێتەوە، میرزا عەلی ئەکبەر و «فخرالکتاب»
ن. میرزا عەلی ئەکبەری صادق الملك (ئەفسەر)، لەهەندێ شوێنی وەك «حدیقە ناصریە» دا، باسی ژیان و سەربهوردەی خۆی کردوە و هەرگیز ناوێکی لەم نامیلکەیە نەهێناوە، هیچکەسی دیکەش لەباسی ژیانی ئەفسەردا، ئاماژەی بە مەسەلەکە نەکردوە. بەم پێیە، ئیحتیمالی میرزا عەلی ئەکبەر کەمترە، بەتایبەت کە قەڵەمی بەهێزی، سەر و گەردنێك لەپێش قەڵەمی نووسەری نامیلکەکەوەیە.

«میرزاشکرالله سنندجی ـ فخرالکتاب» ـ رووداونووس و کاتبی دەزگای حکوومەتی کوردستان بوە. ناوبراو، بەگوێرەی نووسینی خۆی لە «تحفەناصری» دا، لە ساڵی ١٢٧٤لەدایك بوە و تەمەنی گەیشتۆتە دە ساڵان کە کۆتایی بە ئەمارەتی خانانی ئەردەڵان هاتوە و هەژدەساڵانیش بوە، بۆتە «مونشی» حاکمانی عەجەمی کوردستانی ئەردەڵان. فخرالکتاب:

١) بەشێك لە مێژوە ناسراوەکەی خۆی واتە «تحفە ناصری» تەرخانی هۆز و تایفە کوردەکانی ناوچەی ئەردەڵان کردوە و وا دەردەکەوێ پەیوەندێك لەنێوان ناوەرۆکی هەر دوو نووسراوەکەدا هەبێت؛

٢) شارەزای بارودۆخی عەشیرەتە کوردەکان بوە؛

٣) بۆماوەیەك، «نایب الحکومە» ی ناوچەی «اسفند اباد» و «ئێلاخ» ی سنە بوە؛

٤) لە ساڵی ١٣١٢ی کۆچیدا لەلایەن حاکمی ئەردەڵانەوە بۆتە مەئمووری لێکۆڵینەوە لە رووداوێکی عەشیرەیی لە ناوچەی زەهاو.

٦) لەساڵی ١٣٠٢ك/٦-١٨٨٥ز دا، لە لایەن حاکمی کوردستانەوە، کاری راگەیشتن بە ئەملاکی دیوانی و باجی کاسب ودووکاندارانی شاری سنەی پێ ئەسپێراوە.

تا ئێرە، «فخرالکتاب»، بە حیسابی پەیوەندییەکانی لەگەڵ مەسەلەی عەشایر و هەروەها باج وخەراجی دیوانی، وێچووترین کەسێکە دەتوانین بە نووسەری نامیلکەکەی بزانین. دەمێنێتەوە مەسەلەی پەیوەند لەگەڵ دەرباری ناصرالدین شاه وکورەکەی.

لێرەشدا، فخرالکتاب خاڵێکی بەهێزی هەیە: بەگوێرەی نووسینی خۆی لە «تحفە ناصری» دا، لای کەم جارێك چۆتە تاران و ویستوویەتی کتێبێکی مێژوویی خۆی پێشکەش بە «مظفرالدین شاه» بکات کە دوای کووژرانی «ناصرالدین شاه» ببوە شای ئێران.

کەسێك کە بارودۆخی کۆمەڵایەتی ئیجازەی چوونی تاران و نزیك بوونەوە لە دەرباری پێ داوە، دوور نییە پێشتریش ئەو پەیوەندییانەی بووبێت و شاە و

کـاربەدەسـتـانی دەربار لەنزیکەوە ناسـیـبـێـتـیـان. ناسینەکەشی، واهەیە لە ڕێگەی «محمود خانی ناصرالملك قره گویزلوو» ەوە بووبێت کە لە نێوان ساڵانی ١٨٨١ تا ١٨٨٣دا، ظل السلطان بە نوێنەرایەتی لەلای خـۆیەوە کـردبوویە حـاکـمی کـوردسـتـان. درەنگـتـر، ناصـرالملك، «فـخـرالکتـاب» لەسـەر کار لادەبات وئەویش بە دڵشکاوی وڵات بە جێ دێڵێ و بۆ هەمیشە لەتاران دەگیرسێتەوە.

هەمـوو ئەو خـاڵانە، پەسندی بۆچوونمان لەمـەڕ نووسرانی نامیلکەکە لەلایەن «میرزا شکرالله سنندجی - فخرالکتاب» ەوە دەکەن، ساڵانی حوکمی «ناصرالملك» و هەروەها دوو سێ سـاڵ دوای کـۆچی دوایی مـەولەوی تاوگوێزیش لەگەڵ ئەم ڕاستیيانەدا یەك دەگرنەوە.

**بەکورتی، دوای هەموو چەپ و ڕاست کردنێک، دوا بڕیار لەمەڕ نووسرانی دەستنووسەکە، لەسەر حەوت مانگی یەکەمی ساڵ ١٣٠٠ ی کۆچی دەدەم، کە دەکاتە دوومانگی کۆتایی ساڵ ١٨٨٢ و پێنج مانگی یەکەمی ساڵی ١٨٨٣. نووسەریش تا کاتێ کە پێچەوانەی مەسەلەکە دەرنەکـەوێت، بە «مـیـرزا شکرالله سنندجی» دەزانم کـە نازناوی دیوانییەکەی «فخرالکتاب» و نازناوی شاعیریی، «فەخری» بوە.**

دوای نوسـرانی ئەم یادداشـتـانە (سـاڵی ١٩٩٦)، لەسـەرچاوەیەکدا چاوم بە بۆچوونی کـاك محـمـد رئوف توکلی بانەیی کەوت کە میرزا علی اکبری وقایع نیگاری

بەنووسەری ئەم نامیلکەیە زانیبوو (سید محمد صمدی، تاریخ مهاباد، ص ٤٤٤).

کاك رەئووف لە بواری مێژووی ئەردەڵانیەکاندا پسپۆڕایەتی زۆری هەیە و هەندێ دەستنووسی سەردەمی ئەوان بۆ نمونە «حدیقە ناصریە» ی میرزا عەلی ئەکبەر و «سیر الاکراد» ی عبدالقادر بابانی چاپ کردوە و بەم پێیە دەبێ بۆچوونەکانی بەجیددی وەربگیرێن.

ئەوەی من پێی گەیشتووم لە ڕێگەی «استقراء» و سەنگ و سووك کردنی سەرچاوە و کەسایەتییەکانەوەیە، وەك پێشتر گوتم لە هیچکامیشیان بەتەواوەتی دڵنیا نیم، جا ئەگەر کاك رەئووف بۆ بۆچوونی خۆی بە سەرچاوەی متمانەپێکراو پشت ئەستوور بێت، من موشکیلەیەك نابینم لایەنی روانگەی ئەو بگرم و میرزا علی اکبر وقایع نیگار (افسر) بە نووسەری نامیلکەکە بزانم. خۆ ئەگەر مەسەلەکە بەو بارە دابکەوێت، کە کاك رەئووف بۆی چوە، دەبێ ئێمەش وای بۆبچین کە ئەم کارە، یەکەم ئەزموونی کتێب نووسینی میرزا علی اکبر بوە و هەر بۆیەش لەباری خەت و رەبتەوە لاوازە (دوو کتێبە ناسراوەکەی تری میرزا علی اکبر وەك پێشتر گوترا، بە ٥ ساڵ و ٨ ساڵ دوای ئەم نامیلکەیە نووسراون).

کـــاك رەئووف لە ســـالّی ۲۰۰۱دا دەقی فـــارسی ئەم دەستنووسەی چاپ وبلاوکردەوە و میرزا عەلی ئەکبەری وەقـایع نیگاری بە نووسـەری دەسـتنووسـەکـە دانا. لە سەرتایەکدا بۆ کتێبەی نووسیوە، کاك رەئووف بەراوردی هەندێ بۆچوون و وشە ورستەی ناو دەستنوسەکەی لەگەلّ ناوەرۆکی کتێبی دیکەی میرزا عەلی ئەکبەر کردوە گەیشتوتە ئەنجامی ئەوەی کە بە گوێرەی ویێچوویی یا نزیکایەتی بۆ چوونەکان و دەقەکان، دەبێ ئەم دەستنووسەش کاری میرزا علی ئەکبەر بێت.

(بڕوانە: میرزا علی اکبروقایع نگار کردستانی، عشائرو ایلات وطوایف کرد، بکوشش محمد رئوف توکلی، انتشارات توکلی، تهران، ۲۰۰۱).

من، وەك پێشتر گوتم، متمانەی زۆرم بە بۆ چوونەکانی کاك رەئووف هەیە و بە هیچ شێوەیەك دژی ئەم هەلّوێستەش ناوەستم بەلاّم پێم خۆشە ئەم هەلّسەنگاندنانەی منیش لە پالّ بۆ چوونەکـانی ئەودا بمێننەوە و تا ئەوسـەردەمـەی کـە مەسەلەکە لە داهاتوودا بە هۆی پەیدابوونی نوسخەیەکی نوێ، لە پڕوپێست دێتە دەرێ ئیحتمالی میرزا عەلی ئەکبەر و میرزا شوکروللاّی فخرالکتاب وتەنانەت کەسێکی سێهەمی جیالەوان بە ئاوالّەیی بمێنێتەوە.

با ئەوەش لێرەدا بڵێم کە دوای دەرچوونی دەقی فارسی دەستنوسەکە لە لایەن کاك رەئووفەوە، کاك د.نەجات عەبدوڵلا پێی ڕاگەیاندم کە قسەی لەگەڵ پسپۆڕی بڵیمەتی کورد محەمەد موکری کردوە وا ئێستا نیشتەجێ فەرەنسەیە ولێی بیستوە کە شێوازی لاوازی نووسین و هەڵسەنگاندنەکانی نووسەری دەستنووسەکە ئیجازە مان پێ نادات بەکاری میرزا عەلی ئەکبەری وەقایع نیگاری بزانین لەبەر ئەوەی میرزا عەلی ئەکبەر کاتبێکی بە ئەزموون و قەڵەم رەوان بوەو خەت و رەبطی نووسەر فڕی بەسەر مونشییایەتی ئەوەوە نەداوە.

وەك پێشترگوترا، ئحتمالێکش لە مەسەلەی دیاری کردنی نووسەری دەستنووسەکەدا ئەوەیە نووسەر تەنانەت کورد نەبووبێت و « مستوفی » یا « محاسب»ێکی عەجەمی دەیوەخانی ئەردەلانەکان بووبێت، دیارە ئەوە ئیحتمالێکی لاوازە بەلام نەگونجاویش نییە. چەند شوێنی کتێبەکەدا هەستێکی ساکار بەوە دەکرێت و بۆ نمونە مەسەلەی « وجەتسیمە »ی ناوی شوێنەکاندا نووسەر قسەی هەڵیت و پڵیت دەکات و یەك لەوانە، لە بەشی ئەردەلانیەکاندا دەنووسێت کە بەکوردی بە ئاشەوان دەڵێن ئەردەلان یاخود لە بەشی داسنیەکاندا هێرش دەکاتە سەر یەزید کوڕی موعاویە، لە کاتێکدا دانیشتوانی سوننەی

ناوچەکە، ئەگەر یەزیدیان خۆش ناوێ سووکایەتیشی پێ ناکەن. دیارە ئەم مەسەلەیەی دوایی واهەیە پرسیاری دیکەی بە شوێندا بێت بۆ نموونە ئەوەی کە دەکرێ نووسەر، کورد بەڵام شیعی بووبێت، کە ئیترنامەوێ بچمە باسێکی ئەوتۆوە.

**٢- عینوانی دەستنووسەکە:**

لەم پەیوەندییەشدا، پێویستە بڵێم نوسراوەکە هیچ ناوێکی بەسەرەوە نییە و ئەو عینوانەی من پێم داوە، بەگوێرەی ناوەڕۆکی هەواڵەکان و هەروەها دێڕێکی لاپەڕەی دووهەمی نامیلکەکەیە کەلەوێدا، نووسەر دەڵێ: ناصرالدین شاه و ظل السلطان فەرمانیان پێ داوە: «ناوی **هۆز و تیرە وتایفەی کوردستان** واتە ئەو شوێنانەی وا کەوتوونەتە چوارچێوەی حکوومەتی کوردستانی ئێرانەوە، لەنامیلکەیەکدا بنووسرێ». سەرنجدان لە ناوەڕۆکی دەستنووسەکە، دەمانهێنێتە سەر ئەو باوەڕەی کەئەم نووسراوەیە لە بنەڕەتدا، «ڕاپۆرت» ێکی ئیداریی بوە نەك مێژوو، بۆ حکوومەتیش نووسراوە نەك بۆ خەڵك.

نموونەی ئەم چەشنە ڕاپۆرتە، سەبارەت بەناوچەی کرماشانیش پێك هاتوە و نوسەرەکەی «حسینقلی سلطانی

کەلهور» بوە کە لە ساڵی ١٣٠٢ی کۆچیدا نووسیویە وئێستا لە کتێبخانەی وەزارەتی دارایی ئێران لەتاران پارێزراوە (١٩٧ب - ٢١٢الف، جلد پنجم). هەر ئەوەی نوسخەی ئەم دوو نامیلکەیە لە وەزارەتی «دارایی» پارێزراون، نیشان دەدات راپۆرتن و بە ئامانجی ئیش و کاری دەوڵەتی و کۆکردنەوەی باج نووسراون.

بە بڕوای من وەك چۆن نامیلکەکە بە فەرمانی شا و شازادەیەکی قاجار نووسراوە، ناوەڕۆك و بابەتەکانیشی هەر لە لایەن ئەوانەوە دیاری کراون و نووسەر لە هیچ شوێنێکی کارەکەیدا، نەیویستوە یاخود نەیتوانیوە ئەو جوغزە بەرتەنگە بشکێنێ و سنوورە دیاری کراوەکانی ببڕێ. بەو بۆچوونەوە، عینوانی نامیلکەکە، دەبێ لەگەڵ ناوەڕۆکەکەیدا، یەك بگرێتەوە و ناوێکی کە بۆی دادەنرێت، پێویستە هاوبابەتی نوسراوەکە بێت.

من لەکۆتایی ئەم باسەدا، دەگەڕێمەوە سەر هۆگەلی ناولێنان و دیاری کردنی عینوانەکە، بەڵام پێشتر دەبێ چەند خاڵێك لەمەڕ چارەنووسی مێژوویی دەستنوسەکە و دەست بە دەست کردنی، بخەمە بەرچاو.

دەستنووسەکە لە بەهاری ساڵی ١٩٩٣دا لەلایەن برای بەڕێزم کاك «فەرهاد شاکەلی» یەوە گەیشتۆتە دەستی من و تەرجەمە و چاپ کردنەکەشی هەر لەلایەن ئەوەوە

پێشنیار کراوە. دەستنووسەکە لە بنەڕەتدا، عینوانی بەسەرەوە نەبوە و کاك فەرهاد بەگوێرەی ناوەڕۆکی وتارەکان و هەمان دێڕی لاپەرە دوو، ناوی « عشایر و ایلات وطوایف کردستان» ی بۆ دیاری کردوەکە هەڵبژاردنێکی گەلێك باشە وتەنیا لەیەك خاڵدا کورتی دێنێ و ئەویش دواتر باسی لێوە دەکەم.

هەروەها کاك فەرهاد بەیارمەتی یادداشتی نووسەر لەمەڕ ساڵی مردنی مەولەوی تاوگوێزی، ساڵی ١٨٨٥ی بە ساڵی نووسینی نامیلکەکە زانیوە کە لێرەش دا خاڵی پێکاوە و لەگەڵ ساڵی ٢-١٨٨٢ ی دیاری کراوی مندا جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە.

دەستنووسەکە بەگوێرەی قسەی کاك فەرهاد لە ئەسڵدا، هی ڕۆشنبیری ڕێزداری کورد «جەلادەت عالی بەدرخان» بوە، لەلایەن «رەوشەن بەدر خان» ەوە دراوە بە برادەرێکی کورد لە کوردستانی داگیرکراوی تورکیا و ئەویش پێشکەش بە کاك فەرهادی کردوە و کاك فەرهادیش بە ئەمانەت داویەتە دەست من کە بۆ ئەم کارە و بۆ هەموو ڕێنموونیەکانی، سپاسی دەکەم.

ماوەیەك دوای وەرگرتنی دەستنووسەکە، دەستم کرد بەتەرجەمە کردنی بۆ سەر کوردی و پاش کۆتایی هاتنی کاری وەرگێڕان، بە هەڵکەوت لە ماڵی برادەرێك لە

پاریس، چاوم بەنوسخەیەکی «ڕۆنیۆ» ی دەستنووسەکە کەوت و تێگەیشتم کە کۆپی هەمان نوسخەی بەردەستی من پێشتر لەلایەن کاك فەرهادەوە دراوە بەکاك «سید محمد صمدی» و ئەویش دەقی ئەسڵی ـ واتە فارسییەکەی بەناوی «طوایف وعشایر کرد» وە بڵاوکردۆتەوە.

کاك محمد، نیو لاپەڕە سەرەتا و ١٦ لاپەڕە پاشکۆی بۆ چاپەکەی خۆی نووسیوە و سەرجەم لە ٤٠ لاپەڕەدا خستویەتە بەر دەستی خوێنەر. سەرەتاکە، تاریخی ١٣٦٥/١٢/١٢ هەتاوی (سێیەمی ئاپریلی ١٩٨٦) ی بەسەرەوەیە وتێیدا گوتراوە دەستنووسەکەی لە مانگی بەهمەنی ساڵی ١٣٦٥ (جانیوەری و فەبریوەری ١٩٨٦) لە کاك فەرهاد شاکەلی وەرگرتوە و ئێستاش، بەبێ هیچ چەشنە ئاڵ و گۆڕێك بڵاوی دەکاتەوە. ناوی «طوایف وعشایر کرد» یش هەر خۆی لەسەر نامیلکەکەی داناوە.

چاپەکەی کاك محمد، یەکەم چاپی دەقی فارسی نامیلکەکەیە و جێگای ڕێز و ئیحترامی منە بەڵام لە دوو شوێنی تایبەتدا، هەڵەی پێوە دیارە کە پێویستە دەست نیشان بکرێن:

١- ڕوانگەی کاك محمد لە مەڕ پاراستنی ئەمانەتی نووسەر و دەست تێوەرنەدانی کارەکەی، بۆتە هۆی ئەوەی هەڵەی زەق و ئاشکرای ڕێزمان و خەتای ڕێنووسیی

دەستنووسەکەش ساغ نەکرێنەوە. مەسەلەکە، کاتێ جیددی دەبێتەوە کە دەبینین ئەوکەسەی وا دەستنووسەکەی لەبەر نوسخەی سەرەکییەوە نووسیوەتەوە، لە نووسینەوەی ناوی کەسایەتییەکان و هەروەها ناوی گوند و چیا و مەڵبەندەکانی کوردستانی ئەردەڵاندا تووشی هەڵەی زەق هاتوە. نووسینی ناوی «هەڵۆ خان» ی ئەردەڵان بە شێوەی «هوخان» و نووسینی ناوچەی «علیشکر» (اسفند ئابادی ئێستا) بە شێوەی «عیشکر»، نیشانەی ورد نەبوونەوەی نوسخە هەڵگرن.

نوسخە هەڵگر، رستەیەکی لەلاپەڕەی دوازدەی دەستنووسەکەدا هێناوە،کە شێوەی هەڵەی بە روونی پێوە دیارە: «به مفاد بی دولتی از نفاق حیز و حکومت ان صفحات ازکف اوها بیرون..» بەڵام کاك محمد هەوڵی راست کردنەوەی هەڵەکەی نەداوە، لەکاتێکدا وردبوونەوەیەکی کەم بۆ دەرخستنی راستەقینەی رستەکە بەس بوو و دەکرا بزانرێ «حیز» ی عەرەبی + واوی عەطف، دەبێ لە ئەسڵدا فیعلی فارسی «خیزد» بووبێت بەواتای «رادەبێت» واتە «بەمفادبی دولتی ازنفاق خیزد، حکومەت...» کە کوردییەکەی دەبێتە: «بەگوێرەی ئەوقسەیەی کەدەڵێن چارەڕەشی بەروبووی دووبەرەکییە، ئەوانیش، حوکماتی ئەو ناوچانەیان لەدەست دەرچوو».

٢- تێگەیشتنی کاك محمد لە واتای «کوردستان» و «کوردستانی ئێران » یش تێگەیشتنێکی گشتییە و جیاوازە لەواتای نووسەر. بەگوێرەی دابەشکرانی جوغرافیایی ئێران لەسەردەمی خۆیدا و تەنانەت بەگوێرەی زاراوەی ئێستای خەڵکی شاری سنە و دەوروبەر، نیازی نووسەر لەکوردستان، چوارچێوەی جوغرافیایی کوردستانی ئەردەڵانە کە شاری سنە و سەقز و بانە تا ناوچەی هەوشار هەروەها مەریوان و هەورامان و جوانڕۆی گرتۆتەوە و مەڵبەندی گەڕووسیشی پێوە لکاوە. ئەگەر لە هەندێ شوێنیشدا باسی هۆزی «زەند» و «گۆران» و «کەلهوڕ» کراوە، بەهۆی نیشتەجێ بوونی هەندێ خێزانی ئەو هۆزانە لەناوچەی کوردستانی ئەردەڵان بوە نەك ئەوەی دەستنووسەکە باسی هەموو هۆزە کوردەکانی کردبێت.

نووسەر خۆی دەڵێ ناصرالدین شاه و ظل السلطان داوایان لێ کردوە باسی «هۆز و تیرە و تایفەی کوردستان ـ واتە ئەوعەشیرانە بکات، وا کەوتوونەتە چوارچێوەی حکوومەتی حاکمی کوردستانی ئێرانەوە»، لە هیچ شوێنێکی دەستنووسەکەشدا باسێك لە هۆزەکانی موکری یا خود هەرکی و شکاك و زەرزا و جەلالی نەکراوە. واتە نووسەر بەکردەوە، واتای کوردستانی لەهەمان

چوارچێوەدا هێشتۆتەوە کە دەوڵەتی ئێران لەسەرەدمی پێش قاجارەکانەوە تا ئەمڕۆ دابینی کردوە. حکوومەتی ئێـران ناوچەی کوردنشینەکانی باکووری لەگەڵ ئازەربایجان خستوە و باشووری ئەردەڵانیشی بەناوی کرماشان و ئیلام و لوڕستان لە قەڵەم داوە! لەبیرمان نەچێ کە مێژوونووسی بەناوبانگ «شێخ محمد مردوخ» ناوی «تاریخ کردستان و توابع» ی لەسەر مێژووەکەی خۆی داناوە، لەکاتێکدا هەموو لاپەڕەکانی مێژووەکەی، جیا لەهەندێ باسی گشتی، تەرخانی مێژووی کوردستانی سنە (ئەردەڵان) کراوە، واتە ئەویش لەفزی کوردستانی بەهەمان واتای «ئوستانی کوردستان» وەرگرتوە.

ئەوە لەکاتێکدایە کە کاك محمد، چەمکێکی گشتیتری لە ناوی کوردستان وەرگرتوە و بەم بۆنەیەوە ١٦ لاپەڕە پاشکۆی خۆی داوەتە دەم کاری نووسەر. لەو ١٦ لاپەڕەیەدا، کۆمەڵێك زانیاری لەسەر عەشیرەتە کوردەکانی ئێران بڵاوکردۆتەوە کە لە عەینی تازەیی و سوودبەخشیدا، موشکیلەیەکیان هەیە و ئەویش ئەوەیە پەیوەندیان بە ناوەڕۆکی نووسراوەی نووسەرەوە نییە.

لەو حەوت هۆزەی والە پاشکۆی کاك محمددا باسیان لێوەکراوە، پێنجیان (دێبوکری، فیض الله بەگی، گەورك ، مامەش و مەنگوڕ) دانیشتووی موکریانن و یەکیان (واتە،

شکاك)، لەوپەڕی باکووری کوردستانی ڕۆژهەڵات دەژی و تەنیا هۆزەکانی دانیشتووی بانەن کە دەکەونە چوارچێوەی کاری نووسەرەوە.

بەکورتی بڵێم، ناوی «عشایر وایلات و طوایف کردستان» (کاك فەرهاد) و «طوایف و عشایر کرد» (کاك محمد) ، هیچکامیان ناوێکی پڕ بەپێست بۆ دەستنووسێك نین کە تایبەت بەناوچەی ئەردەڵان کراوە و باسی هیچ هۆزێکی کوردی لەودیوی سنووری کوردستانی ئەردەڵان نەکردوە.

کەوابوو، بەڕێ و جێ ترین نێو بۆ ئەم نامیلکەیە، بریتی دەبێت لە «هۆز و تیرە و تایفەی کورد لە کوردستانی ئەردەڵان» گەرچی نووسەر هەر سێ تێرمەکەی بۆیەك واتا بەکار هێناوە و جیاوازییەکی لەنێوان هۆز و تیرە یا تایفە دانەناوە.

لە کۆتایی باسەکەدا دەبێ بڵێم منەتباری خوالێخۆش بوو دوکتور «عابیدی سراج الدینی» و کاك «ئەسعەدی سراج الدینی» م بۆ پێداچوونەوەی نامیلکەکە و خوێندنەوەی یادداشتەکانی من. هەروەها سپاسی زۆری کاك ئەمیری حەسنپوور دەکەم بۆ ئەو ئاگادارییەی وا

لەمەڕ دەستنووسەکانی وەزارەتی دارایی ئێران پێی داوم.سپاسی مامۆستا محمەد عەلی سوڵتانی دەکەم بۆ روون کردنەوە بە نرخەکانی. سپاسی زۆری «مامۆستا کەمال مەحمود فەرەج» یش دەکەم بۆ بەسەرداچوونەوە و راست کردنەوەی هەڵەی رێنووسی و رێزمانی تەرجەمەکە. سپاسی زۆری هاوسەرم نەسرین برناو برایان کاك خانی هەژار، کاك عەتا موفتی وکاك سەرکەوت مەحمود و بنکەی راگەیاندنی کوردی لە لەندەن دەکەم بۆ یارمەتی بەنرخیان لەمەڕ تایپ و هەڵەگرتنی دەقی کوردی و فارسی. دەقی کوردی نامیلکەکە، کاتی خۆی خوالێخۆش بوو «سوبحیە نادر» تایپی کرد و رۆژێك پێش سەفەری بێ گەڕانەوەی بۆ کوردستان بۆی هێنامەوە. یادی بەخێر بێت. پێویستە بڵێم ئەم نامیلکەیە چەند ساڵێکە ئامادە کراوە و چاوەڕوانی چاپە!

# بە ناوی خودای بەخشێنەر و دلۆڤان

سپاسی بێ سنوور شایانی خولڤێنەرێکە نیهادی خاوینی ئادەمی لە ئامێتەکردنی ئاو و خاك خۆلڤاند [و] لە تۆرەمەی ئادەم، چەندەها نەتەوە و ئۆممەتی لە پەردەی نەبوونەوە هێنایە گۆڕەپانی هەبوون؛ هوالذی خلقکم من نفس واحده وجعل منهما رجالا ونساء.

ستایشی بێ ئەژمار ڕەوای بەدیهێنەرێکە تیرە و تایفەی رەوشت جیاواز و هۆزانی بەکردەوە و شێوە جیاجیای لە ڕەگەزی ئەو پایەبەرزە خولڤاند؛ وجعلناکم شعوبا وقبائلا لتعارفوا.

درووودی لەرادەبەدەر بۆ تیشکی نووری خودا و هۆی سەرەکی خولقانی زەوی و ئاسمان و ئابڕووی تۆرەمەی ئادەم وحەووا، گەورەی هەموو پێمێرد و پێغەمبەران - محمد، مەزنی هەردوو جیهان و مرۆڤ و جندۆکە و هەردو فیرقەی عەرەب و عەجەم- سلاوی خودا لەخۆی و بنەماڵەکەی بێت؛ العرش ما طلعت شمس و مالاح نجم فی دجی الظلم.

نەرم و نیانی رۆح و با و رەحمەت و بەهەشت لە رۆحی بنەماڵەی پاك و مەزن و یارانی هەڵبژاردە و پێشەوایانی تەریقەت؛ سادە لاترید الا رضی الله کما لاترید الا رضاها لم یکونوا للعرش الکنوزا خافیات سبحان من سواها.

دوای ئەم قسانە، لە سەردەمی پیرۆزی ئێستادا فەرمانی بەرز و مەزنی شاهەنشای عالەم پەنا، پشتیوانی ملك و میللەت و پارێزەری دین و دەوڵەت، سێبەری پاکی دەرگانەی خوا و هۆی ئاسایش [و] هێمنایەتی، شاهەنشای صاحبقران و میراتگری تاج و تەختی کەیان، شای شاهان و خاقانی خاقانان، هەوری بارانبار و شیری صائل و قەڵەمی قەزا و قەدەر، یاریکاری ئیسلام و خاوەنی ئاڵای سەرکەوتوو - ابوالنصر ناصرالدین شاه قاجار، لازال للدین و الاسلام ناصرا و لکسر الاصنام کاسرا.

هەروەها جـەنابی پایەبەرزی مـەزنی نەزم و نیـزامی هەمـوکـاریْك و هەمـوو خـەڵکێك و ئاسـایشگەی مـڵك و پاسەوانی دەوڵـەت و پارێزەری گەل، باڵی بەرانـبەردانەری تەرازووی عـەدڵ و داد و قامچی سزادانی دەستی زوڵم و زۆر، خاوەنی ئەستیرەی پیرۆز و جێگە و شوێنی بەڕێز، شـازادەی مـەزن "ظل السلطان "(٢) خـودا سـایەی بەرزی پایەدار بکات، فـەرمـانی وەك قـەزا بەهێـزی، شـەرەفی دەرچوون و بەڕێوە چوونی پێ درا، کـە: ناوی ئەو هۆز و عـەشـیـرە و تـیـرە و تایفـانەی وا لەناو سـنووری خـاکی کوردستاندان - واتە، هەموو ئەوانەی کە دانیشتووی نێو حکوومـەتی حـاکـمی کـوردسـتـانی ئێـرانن بە کـۆچەر و نیـشـتـەجێ وخـەڵکی ئاوایی و دەشت، بەکـورد و غـەیرە کوردەوە، بەژمارەی راستەقینە یاخود بەمەزندەی خێزان و کـەس و کـار و راگـەیاندنی بنەچەك و ئەسـڵی پشتـاوپشـتـیـان، بە تاریخی راگـوێزران و کـۆچی هەمـوو عـەشـیـرە و هۆزێك لەخـاکـێکەوە بۆ خـاکی تر، هەروەها دەرخـسـتنی ئەو راسـتـیـەی لەکـام رەگـەز و تایفـە و تیرەیەکن، دانیشتووی کام شوێنن، هاوڕەگەز و تیرەیان لە چ شوێنێك دەژین لەسەردەمی کامە پادشا و بەفەرمانی کـام سـوڵـتـان و لـەبەر چ هۆیەك لـە زێدی خـۆیان راگـوێزراون، هۆی ناوبران و ناونرانی هەمـو ئەوتایفـانەی

وا ئێستا هەن و پێشتر بوون یا چوون، بە شوێنی ئێستایانەوە چ لە گوند بژین چ لە ئاوایی، گەرمێن و کوێستان کردنیان لە بیابان بێت یا لەدەشت و چیا، هەمووی لە پەرتووکێکی بێ درۆ و دەفتر و نامیلکەیەکی تەواو دا، بنووسرێ و راستەوخۆ بنێررێتە خزمەت جەنابی موستەطابی " صنیع الدولە - وەزیری انطباعات (٣) و وەرگێڕی تایبەتی دەرگانەی بەرز [ی شاهی].

ئەوە بوو، کاتێ بەڕێوەبردن و بە ئەنجام گەیاندنی ئەم ئەرکە، خرایە ئەستۆی منی بچووکی خەتاباری ناچیز، سەرەڕای کەم دەسەلاتی و نەبوونی توانا، سەردانەواندن بۆ فەرمانەکەم بەواجبی سەرشانم زانی و دەستم کرد بەنووسین.

بیرورای لە ئاوێنە روونتری خاوەن هۆشان و بلیمەتانی زیرەك وزانا، لێیان ئاشکرایە کە هەموو حەشامات و عەشیرەت و تیرە وتایفەی دانیشتووی کوردستانی ئێران جیا لەساداتی پایەبەرز و چەند بنەماڵەیەکی تۆرەمەی "طوس نوذر"(٤) کە لەم ناوچانانە بە "کەوش زێڕینە" ناوبانگیان دەرکردوە، هەروەها ژمارەیکی کەم لە تیرە و تایفەی تر کە هاتوون و لەکوردستان گیرساونەتەوە، پاشماوەی خەڵکەکە هەمووی لە هۆز و عەشیرەتی کوردن، جا بەو بۆنەیەوە، پێش دەست پێ

کـردن بە باسـەکـە، پێـویست بوو سـەرەتایەك بەهەندێ زانیارییەوە لەمەڕ سنووری خاکی کوردستـان و ئەسڵ و بنـەچەك و رەگــــەزی کـــورد و ئەو لق و پۆپەی وا لەکوردبۆتەوە، هەر [بەکوردیش] دەناسـرێن، بنووسرێ و رون بکرێتــەوە [هەرکـامـیـان] لە چ تیـرە و هۆز و تایفەیەکن.

کەوا بوو، بناغەی ئەم پەرتووکەم لەسەر سەرەتایەك و چەند بابەت دانا کـە بە گـوێرەی پیـتی ئەلف و بێ [باسی] هەر تاقمێکیان لە "بابەت" ێکی جیاوازدا بنووسم.

# سەرەتا: بریتیە لەسێ "مەقسەد"

## مەقسەدی یەکەم

### باسی شوێن و ژمارەی کورد و سنووری کوردستانە:

شاراوە نەمێنێ کە وەك دانەری «نۆزهەت القلوب»(٥) و نووسەری «شەرەفنامە» واتە شیخ شرف الدینی بەدلیسی سنووریان بۆ دیاری کردوە، کوردستان وڵاتێکی پان و درێژە و ئیقلیمێکی حەقیقیە نەك مەجازی.

لە درێژاییدا، کوردستان لەکوێستانەکانی لۆڕستانی گەورە و سەرەتای خاکی فارسەوە هەتا جزیرەی لووت(٦) و ئەرمەنستانی عوسمانی دەکشێ واتە ئەو شوێنەی کە تا ئەستەموڵ بیست قۆناغی کاروان زیاتری نامێنێ و پانتاییەکەشی لە دەوروپشتی «قسقە»(٧) وە تانزیك بەغدا و عەرەبستانە.

لە کۆتاییەکانی حکوومەتی «بەنی عەبباس» دا، «نصرالدولە احمد کوڕی مەروانی کوردی» بۆتە شاهی ئەم ناوچەیە وا ناوبانگی بە «کوردستان» دەرکردوە و ناوی «سوڵتان» یان لێ ناوە و سکەیان بەناویەوە لێ داوە.

پاشان بە گوێرەی زەمانە، لەهەر شوێنێکی[ناوچەکە]دا، حاکمێکی جیاواز دەسەڵاتی

سەندوه، بۆته پاشاگەردانی و[هەرکەس] بۆ ماوەی سەردەمێك لەبەشێکی خاکەکەدا حکوومەتی کردوه. ئێستاش ئەو ولاته پان و بەرینه، بەشێکی تەواوکەری خاکی دەوڵەتی بەرێزی ئێرانه و هەندێکی تری به بەشێك لەخاکی دەوڵەتی بەرزی عوسمانی دەژمێررێ.

## مەقسەدی دوهەم

### له باسی بنەچەکی کوردانداية؛

شاراوەو سەرپۆشراو نەمێنێ، کە قسەی مێژوونووسان لەسەر بنەچەکی کوردان جیاوازه، هەندێکیان لایان وایه لەتۆرەمەی کەسێکن بەناوی " کورد" و ئەویش له سەردەمی زوحاکی عەرەبدا [ژیاوه]. وەك بیستراوه و نووسراویشه، هەموو رۆژێ بۆ خواردنی ئەو مارەی وا له سەرشانی شین ببوو، کەسێکیان بەنۆبه دەکوشت و مێشکی سەریان دەرخواردی مارەکه دەدا. هەموو رۆژێك بێ پسانەوه، دوو هەژاریان دەدایه دەست کابرای چێشتکەر بۆئەوەی مێشکیان بکاته خواردنی مارەکان.

کـــابراش کـــه مـــرۆڤـــێکی باش بوو، هەمـــوو ڕۆژێ یەکێکیانی دەرباز دەکرد و لە جیاتیان، مێشکی سەری مەڕێکی تێکەڵاو ئەوی تر دەکرد و دەیبرد بۆ لای زوحاك و دەرخواردی مارەکانی دەدا. هەڵاتوەکانیش لەسەحرا و بیـــــابانـی دوورەدەست و لە ئەشکەوت و کـــــەلاوە دا دەحاوانەوە.

کاتێ نۆرەی کەسێك بەناوی "کورد" هات، چێشتکەری گـــۆڕین دەربازی کـــرد و ئەویش بە خـــۆی و ژنەکـــەیەوە ئاوارەی ئەو شاخانە بوو. کە بە "کوردستان" ناو دەبرێن و لەو ســـەردەمـــەدا هێـشـتـا ئاوەدان نەبـبـوونەوە. پاش مـــاوەیەك وەچەی زۆریان لێ کـــەوتەوە و دوای زگ و زای زۆر، تایفـــەکـــەیان بەناوی ئەوەوە ناونا و لەناو خـــەڵکی دیکەدا، بە ئازایی ناوبانگیان دەرکرد.

بە گـــوێرەی هەواڵدانی نووســـەری شـــەڕەفنامـــە- شـــێخ شەرەف الدین بەد لیسی، کاتێ کە خوسرەوی پەرویز- پادشای عەجەم،(٨) نامەی بۆ حەزرەتی پێغەمبەر سلاوی خودای لێ بێ نووسی، گوتی کەسێکم گەرەکە نامەکەم لە "مەداین"ە وە بەرێ بۆ "مەدینە" . کەس کارەکەی لەخۆی نەگرت تا کوردێکیان دۆزیەوە کە کارەکەی بەپێی فەرمانی خوسرەو گرتە ئەستۆ و لەماوەی بیست ڕۆژ دا نامەکەی گەیاندە جێ.

یاران [ی پێغەمبەر] کە لەخزمەتیدا بوون، سەریان سوورما چۆن لە ماوەیەکی وا کەمدا توانیویە ڕێگایەکی وا دوور ببڕێ. حەزرەت دروودی خودای لێ بێت، فەرمووی ئەوکەسە لە هۆزی کوردانە و پاشان فەرمووی خوداوەندی میری مەزن هێز و توانا و خێرایی و ئازایەتی و تواناییەکی ئەوتۆی بەو هۆزە بەخشیوە کە بەشی کەم گەلانی دیکە بوە، بەلام حیکمەتی بەرزی خودایی وای بەباش زانیوە کە دووبەرەکی و نێوان ناخۆشی و کێشە و هەرای وا بخاتە ناویانەوە کە هۆزانی دیکە لەدەست خراپەکاری و دوژمنایەتییان ئاسوودە بن و هەموو کاتێ خۆ بە شەڕ و پێکدادانەوە خەریك بکەن و نەپەڕژێنە سەر هۆزانی تر.

بەلام راستترین بۆچوون هی "ئەحمدی کوڕی خەللەکان" ە کە لە مێژووەکەی خۆیدا نووسیویە(٩) و ئەویش هەمان بابەتە، کەابو عمرو بن عبدالله ـ نووسەری کتێبی "استیعاب"(١٠)، لە نامەی "قصدوامم" دا کاتێ باسی بنەچەکی عەرەب و عەجەم دەکات، دەگێڕێتەوە و دەڵێ "کورد، لە بنەچەکی "عمرو مریقا" ن کە ئەویش لە تۆرەمەی "ملووکی یەمەن" بوە و بەپێی تیپەڕبوونی زەمانە، لە خاکی یەمەن پەڕەوازە بوون و لە کوردستان گیرساونەتەوە و وەچەیان لێ کەوتۆتەوە، وەك شاعیر گوتوویە:

لعمرك ما الاكراد من نسل فارس
ولكنه من نسل عمروبن عامر

"عـامـر" ی باپیرەگـەورەی کـورد، بەهۆی دەهەندەیی زۆرەوە نازناوی "مـاء الـسـمـا" ی پێ دراوە وەك مـەولەوی ڕۆمی فەرموویە:

ببە بەعاسمان، ببە بەهەور و باران و بڕژێ خوارەوە
ئاوی پلووسك کەڵکی نییە
پلووسك مایەی شەڕ و هەرای دراوسێیانە
بەڵام ئاوی باران باخچەی سەد ڕەنگ بەرهەمدێنێ(١٢)

"ئەوس" و "خەزرەج" کە پشتیوانی حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) بوون، لەتۆرەمـەی "عـامـر" ن و "عـمـرو" ی کـوڕی هەموو ڕۆژێ دوو ئاوەڵ داوێنی نەخشاوی لەبەر دەکرد و بەشانی خۆی ڕەوا نەدەدی بەکەسێکی دیکەیان ببەخشێ بیکەنە بەریان. جـا، کـە ئـێـوارێ دادەهات، بەرگـەکـەی دەدڕاند و هەر بەم بۆنەیەوە نازناوی "مریقا" ی پێ درا.

"ابوالقاسم فـێردەوسی" لەم دوو بۆچوونە، یەکەمـیانی پێ راسـتـتـر بوو و لە «شـاهـنامـە»دا(١٣)، دەڵێ [بۆ شـیـعـرەکـانی فـیـردەوسی بڕوانە پەڕاوێزی ژمـارە ١٣]. شاهانی خاوەن ئیرادە و دادگەر و حاکمانی لەسـەرخۆ و جوامێر لە هۆزی کوردان هەڵکەوتوون و لەوانە، "صـلاح الدین ایوبی" یە، کـە مـیـسـر و بیت المقدس و شـامـات و

مەككە و... هتدی سەرلەنوێ لەفەڕنگ سەندەوە و خستیەوە دەست خەلیفەکانی بەنی عەبباس.

دەقی کتێبانی مێژوو و "سیر"، شاهیدی ئەم حاڵە و پەسندکەری قسەی ئێمەن و باسی چاکی و خاسی و سیفەتی باشی ئەو سوڵتانە مەزنە لە دەفتەری ڕۆژگاردا نوسراوە و زۆربەی عالمانی ئیسلام بە هەڵبژێراوی خولەفای راشدین و مەزنترین شەرکەرانی ڕێگەی ئایینی ئاشکرا[ی ئیسلام] ناوی دەبەن. لەنەوە و نەتیجە و بنەماڵەی ئەو سوڵتانە، گەلێك کەسانی ناسراوی ناودار هەڵکەوتوون.

## مەقسەدی سێهەم

لەباسی هۆزوتیرەی گەورەی ئەو کوردانەیە کە لق و پۆکانی تر بەوان دەگەنەوە و هەمووی، بەکورتی و بەبێ درێژدادڕیی [دەنووسم]:

**یەکەم: هۆزی کوردی ئەردەلانی،** کەنۆرەمەی بابا ئەردەلانن و هەندێ کەسیان بەپێی چەرخی ڕۆژگار لە زۆر ناوچەی کوردستان حکوومەتیان کردوە و ئێستاش کۆمەڵێکی زۆریان لەناوچەگەلی کوردستان نیشتەجێن.

**دووهەم: هۆزی "لوڕ"،** کە زێد و خاکیان لە ئیسفەهانەوە تاسنووری عەرەبستانی ئێران [خۆزستان] و لە "هەمەدان" و جەمسەری خاکی "عیراقی عەجەم"(١٤) ەوە تا سنووری "عێراقی عەرەب" کێشراوە و بەشێکیان بە تێپەڕبوونی زەمانە و سەردەم، لە "قەزوێن"(١٥) وشوێنی تر، نیشتەجی بوون.

**سێهەم: هۆزی "کرمانج"**، کە بە "بابان" ناویان دەرکردوە و شوێنی دانیشتنیان کەوتۆتە لای کەرکووك و سولەیمانی و شارەزوور و کۆی و حەریر و ساوجبلاغی موکری(١٦)؛ بەشێکیشیان لە "بانە" کە مەحاڵێکی ئێرانە، دا دەنیشن.

**چوارەم: هۆزی «گۆران»** کە زۆربەیان لە کرماشان و کوردستانی ئێران نیشتەجێن.

**پێنجەم: هۆزی «لەك»** کە زۆربەیان لە کولیایی و کرماشان و هەمەدان و کوردستانی ئێران دەژین؛ کە مایەسیەکی کەمیشیان بەهۆی پێشهاتی ڕۆژگارەوە کۆچیان کردوە بۆ ئیسفەهان و لەوێ نیشتەجێ بون [بەختیاری؟].

**باسی هۆزی شەشەم نەکراوە. وەرگێڕ]**

**حەوتەم: هۆزی «مافی» و «نانەکەلی»**، کە شوێنی دانیشتنیان لەپێشدا کوێستانەکانی ڕەواندز و هەولێر لەخاکی عوسمانی و ساوجبلاغی موکری ملکی ئێران بوە و بەهۆی ملهوڕی وسەربزێوییەوە، بەفەرمانی خوالێخۆش بوو شاعەبباس سەفەوی کۆچیان پێ کراوە و لە "ڕەی" و "شەهریار" و "قەزوێن" دایان مەزراندوون.

**هەشتەم: «کوردۆسی» و «کوردی ئێزەدی»**، کەشوێنی دانیشتنیان لە خاکی عوسمانیدا، هەر لەمووسڵەوە تا مەردین و لە دیاربەکرەوە تاحەڵەبی داگرتوە و پەنام بۆخوا، شەیتان بەخودا و "یەزید" یش بەپێغەمبەری ئەو دەناسن - بەڵێ خودای ئەوتۆ شایانی پێغەمبەرێکی وەهایە! هەر موسوڵمانێکیان وەگیر کەوێ و لە ڕۆستی بێن، گیانی لێ دەستێنن.

**نۆهەم: هۆزی «جاف»**، کە زۆربەیان کۆچەرن و گەرمێن و کوێستان دەکەن و هێشتا نیشتەجێ نەبوون.

**دەهەم: هۆزی «لۆ لۆ»** [لوو لوو؟]، کە زێدەکەیان قەڵای چیایەکە پێی دەگوترێ زەنگار و کەوتۆتە خاکی عوسمانییەوە. خەڵکێکی ئێجگار ساغ و بێ ئازارن و بێجگە لە کاسبی و کشت و کاڵ، هیچ کارێك ناکەن، دەربەستی خانووبەرە کردن و بەدەست هێنانی کەرەسە و شتوومەك نین. ئەم هۆزە، هیچ کاتێك هەتا ئێستاش زانا و بلیمەت و خوێندەوار و زانیار و تێگەیشتوو و خەت خۆش و هونەروەریان لێ هەڵنەکەوتوە. بەنیسبەت کوردانی تر، میهرەبان و میوان خۆشەویستن.

## بابەتی یەکەم

باسی ئەو هۆزانەی وا پیتی [یەکەمی ناویان] ئەلف [واتە هەمزە]یە

**یەکەم - ئەردەلان**

لەباری خوو و خدە و سروشت و ئاکاری باش و کردەوەی چاك و فەرهەنگی مرۆڤایەتی و ئازایەتی و دەهەندەییەوە، لە ژوور هۆزەکانی دیکەی کوردەوەن و لەهەموو سەردەم و زەمانێکدا، خانانی ناوداری بەشان و

شـــەوكـــەتی وەك «خـــان ئەحـــمـــەد خـــان»(١٧) كـــوڕی «هەڵۆخـــان»(١٨) یان لێ هەڵكەوتوە كـە شـاه عـەبباسی سەفەوی(١٩) بەهۆی ئازایەتی و بەجەرگی و لێهاتووییەكی زاتیـیـەوە كـە لێی بەدی دەكـرا، فـەخـر و شـەرەفی پێ بەخـشی و "زێڕێن كـلاو خـانم" ی خـوشكی خـۆی پێ مەرحەمەت كرد و هەر بە حوكم و ئەمری شای رەحمەتی، مـووسڵ و رەواندز و عـیـمـادییـەی گـرت و چەند سـاڵێك لەبەشی زۆری كوردستاندا حوكماتی كرد.

هەروەها، خـــواڵێـــخـــۆش بوو «خـــوســـرەوخـــانی دووهەم»(٢٠)، نەبیـرەی سـوبحـان وێردی خـان ، كـە بە ئازایەتی و بەجـــەرگی و دەهەندەیی ناوی دەركـــردبوو، كردەوەی گەورەی ئەوتۆی لێ وەشایەوە كە ناوی ناوداری لە رووپەڕی ڕۆژگـــار دا مـــاوەتەوە و یەك لەوانە، تێك شكاندنی خواڵێخۆشبوو "الله قلی خانی زەنگەنە" بوو كە كورتەكەی بە شێوەی خوارەوەیە:

پاش ئەوەی زنجیرەی «زەندییە» كۆتاییان هات، "ئەڵلا قوڵی خانی زەنگەنە" كە حاكمی كرماشان بوو، سەودای داگـیـركـردنی عـێـراق و كـوردسـتـانی كـەوتە سـەر و بە تۆپخانە و لەشكری زۆری كوردی كرماشان و سونقوڕ و كـــولیـــایی و لوڕەوە كـــەوتە ڕێ. لە لایەكی دیكەوە، خـوسـرەوخـانی بەهەشـتـیش لە سنەوە هات و هەر دوو

لەشکر لە سونقورِ بەیەکیاندادا، دوای هەولّ و تێکۆشانی زۆر، سوپای کوردستان سەرکەوت و ئەللّا قولّی خان کوژرا.

خوسرەو خان رووی کردە کرماشان لە دوو فرسەخی شار، حاجی عەلیخانی مامی ئەللّا قولّی خان، بە پێشکەشی زۆرەوە هات و داوای لێبووردنی کرد. خوسرەوخانیش گەڕایەوە بۆ کوردستان.

کارێکی دیکەی [خوسرەخان]، راونانی جەعفەرخانی زەند بوو [یەکێ لە جێگرانی کەریم خانی زەند، کە لە ١٢٠٣ / ٩-١٧٨٨ دا کووژراوە] کە بە حەشیمەتی زۆری "زەند" و فارس و لورِ و هتد... ەوە، بە ئامانجی گرتنی ناوچەکانی کوردستان و عێراق، هاتە هەمەدان. هەر ئەوەندەی هەواڵەکە گەیشتە گوێی خوسرەوخان، بە سوپای ئەردەڵانەوە کەوتە رێ و لە «بەهار » ی هەمەدان، هەردوو سوپا گەیشتنە یەك.

دوای شەڕ و پێکدادانێکی زۆر، خوسرەو خان سەرکەوت و جەعفەرخانی زەند لە گرێژەنە چوو، واتە شکا و هەڵات. [خوسرەوخان] کەوتە شوێنی و "مەهدی بەگی شوقاقی" کە شاعیرێکی ناودارە، لە خزمەتیدا بوو، چەند فەرد شیعری "مثنوی" بۆ پیرۆزبایی عەرز دەکات کەسەرەتاکەی ئەم فەردەی خوارەوەیە:

موسم دی خسرو بهمن و قار خیمه برافروخت
چوگل دربهار
«لەمانگی یەکەمی زستاندا، ئەو خوسرەوەی، ویقاری وەك بەهمەن {شای کەیانی}ە، وەك گوڵی سەردەمی بەهار خێوەتی هەڵدا».
هەروەها[خوسرەوخان] هەلی شکاندنی اسماعیل خانی زەندیشی بۆ هەڵکەوت.
یەکی دیکە لە خانانی ناودێری ئەردەڵان، ئەمان اللە خان"(٢٥) ی بەهەشتییە کە خاسە کوڕی هەر ئەو خوسرەوخانە بوو. ئەمان اللە خان، لەسەردەمی خاقانی عاقیبەت بەخێری خوا لێخۆش بووی بەهەشتی دا(٢٦) خودا لە دارالسروری بەهەشت بەرگی نووری لەبەرکات، شانازی و فەخری حکوومەتی کوردستانی پێ درا و خزمەتی بەرچاو و نۆکەرایەتی شایانی بۆ دەوڵەتی مەزنی ئێران و حەزرەتی خاقانی بەهەشتی کرد، لە خانانی ناودار و ئەمیرانی بەشان و شەوکەتی سەردەم و زەمانەی خۆی دەژمێررا و شاهەنشای دین پەنا چاوی گرتبووی کە خوالێخۆشبوو خوسرەو خانی سێهەم(٢٧)، کوڕی گەورەی ئەوی بە زاوایی خۆی قەبووڵ فەرمووو و «حوسنی جیهان خانم» ی پایەبەرزی کە نازناوی "والیە" بوو لێ مارەکرد و بەم شێوە فەخر و شانازی پێ بەخشی.

هەروەها فەخر و شانازیی زاوایەتی جەنابی پایەبەرز "نایب السلطنە"{عەباس میرزا}ـ خودا خاکی سەرگۆڕەکەی بۆن خۆش کات، بە نەبیرەی [امان اللە خان](٢٨) بەخشرا.

شاراوە نەمێنێتەوە کە زۆربەی هۆز و عەشیرەی ئێران پەیوەندیان بە ئەردەڵانەوە هەیە یا لە تۆرەمەی ئەوانن یاخود بەهۆی سەردانەواندن و ئیتاعەی بەنی ئەردەڵانەوە بەوان نیسبەت دراون.

هۆی ناونانی "ئەردەڵان" و "ئەردەڵانی" بەگوێرەی کتێبی مێژووی کورد [دەبێ نیازی شەرەفنامەی بەدلیسی بێت]، ئەوەیە کە باپیرەگەورەیان ئاشەوان بوە و لە زمانی کوردی دا بە ئاشەوان دەڵێن "ئەردەڵان"[!](٣٠).

پاش ئەوەی {باوە}"ئەردەڵان" بەحوکمی چەرخی ڕۆژگار تووشی هەژاریی و نەداریی دەبێ لە شامەوە بەرەو دیاربەکر و مووسڵ دێت، دوای ماوەیەك لەگەڵ [کچی] مەزنماڵێکدا پەیمانی ژن و مێردایەتی دەبەستێ و کوڕێکی لێی دەبێ کە ناوی "کلۆڵ"(٣١) ی لێ دەنێن.

دوای ئەوەی "کلۆڵ" گەورە دەبێت، لەبەر لێهاتوویی زاتی و دەرکەوتنی نیشانەی ئازایەتی و بەجەرگی، حکوومەتی مووسڵ و دیاربەکری پێ دەدرێ هەتا ئەوەی لە سەردەمی غاڵب بوونی چەنگیزخان دا(٣٢) لەسەرکاریان

لابرد و [ئەویش] بەژن و منداڵەوە ئەو ناوچەیەی بەجێ هێشت و لە شارەزوور گیرسایەوە.

پاش ماوەیەك، لەو شوێنەش دەوڵەت و ماڵی پێکەوەنا و حکوومەتی پێ بەخشرا. ئێنجا لەسەرکار وەلانرا و چوو بۆ "پلێنگان" کە گوندێکی کوردستان {ی ئێران}ە و شوێنێکە وەك قەڵا وایە و بارودۆخی سروشتی بەشێوەیەکە، گیران و داگیرکردنی، بەهۆی سەختی و ئەستەم بوونی رێگاکەیەوە، گەلێك زەحمەتە. لەوێ، لەناو گۆرانەکاندا، شان و شەوکەتێکی پێکەوەنا و بوو بەسەرۆك و خاوەن ئیختیاریان.

لەژێر دەسەڵاتی چەنگیزدا، سەرلەنوێ گەڕایەوە سەر حوکم و بابان و کۆی و حەریر و کوردستانی ئێرانی خستە ژێردەست و بەڕێوەبردنی کاری ئەو ناوچانە خرایە ئەستۆی لێزانی و لێهاتوویی ناوبراوەوە. وەچە و نەوە و نەتیجەی ئەو، یەك بەدوای یەك لەو وڵاتانەدا گەیشتنە حکوومەت و سەرووەری(٣٤).

بەڵام لەدواییدا بەهۆی زۆربوونی وەچەوە و وەك بەتایبەت لەناوکورداندا رەسمە، یەکیەتییان بوو بە چەند بەرەکی و نێوان ناخۆشی و بەپێی ئەوەی کەگوتراوە: «ئاکامی دو بەرەکی،چارەڕەشییە»، حوکمی ناوچەکانی ناوبراو جگە لە کوردستانی ئێرانی لەدەست چوو. ئینجا

ورده ورده بەهۆی کردەوەی وریایانەوە، گوندی "پلینگان" یان کە بەدەست حاکمانی کەلهوڕەوە بوو، لەوان سەند و تێیدا نیشتەجێ بوون.

هەتا ئەوەی لە ساڵی ١٠٤٦ دا، بەحوکمی «شاه صەفی» بەهەشتی [شەشەمین شای زنجیرەی سەفەوی، لە ١٦٤٢ دا مردوە]، قەڵای پڵینگانیان بەناوی ئەستەم بوونی شوێنەکە و زەحمەت بوونی هات و چۆوە رووخاند و لە سنەدا نیشتەجێ بوون [پێتەختی ئەردەڵانەکان لە پڵینگانەوە سەرەتا گوێزرایەوە بۆ حەسەناوا و پاشان بۆ سنە. وەرگێڕ].

گوندی "سنە"، ئەو دەم "سینە" ی پێ دەگوترا و شوێنی تایفەی "کەوش زێڕینە" بوو ـ کە وەك دەگوترێ بنەچەکیان دەگاتەوە "طوس نوذر". [ئەردەڵانەکان] لەوێ دەستیان کرد بە دروست کردنی بینا و مزگەوت و مەدرەسە هەتا ئەوەی ورده ورده ژمارەی دانیشتوان رووی لە زیادی نا و ئێستا بۆتە شارێکی خاوەن ئیعتیبار و لەگەڵ شاراندا حیسابی بۆ دەکری.

بەهۆی بوونی دوو لقی "لوڕی گەورە" و "لوڕی بچووك" ەوە، زۆر جار [کۆی عەرەبی "ئەلوار"] لەجیاتی وشەی لوڕ بەکار دەبرێت. تیرەی "زەند" و "بەختیاری" ش بەشێکن

لەکوردی فەیلی و لوڕی ناوچەی "عەلی شەکەر"(٣٧) و لە "مەلایر" و "پەریە"(٣٨) دادەنیشتن . لوڕستان هەر ئەو شوێنەیە کە ئێستا بەو ناوەی ئەوانەوە دەیناسین.

هۆزی ناوبراو، بەهۆی چەتەیی و رووتاندنەوەی ڕێبوار و کاروانچییەوە هیزێکیان پێکەوەنا، تا ئەوەی "نادر شای ئەفشار بە دەسەڵاتەوە، ناردیە سەریان و بە زۆرەملێ رایگوێستن بۆ «دەرەگەز» و «ئەبیوەرد» و خۆراسان ولەوێ نیشتەجێی کردن. دوای لەناوچوونی ئەفشار و دەسەڵات سەندنی "کەریم خانی زەند"، زۆربەی ئەو کەسانە گەڕانەوە شوێنی خۆیان. بەدابی لوڕ، کە بەمەزنی خۆیان دەڵێن "تووشماڵ"، بە کەریم خانیشیان کە گەورەی هۆزەکە بوو، دەگوت "تووشماڵ کەریم خان".

کاتێ کە "شاهرخ شا"(٤١) حکوومەتی ئیسفەهانی بە "ابوالفتح خانی بەختیاری" دابوو، کەریم خان و "عەلی مەردان خان(٤٢)" بەسەریاندادا و لەچەمەنی "قوهمیز" روبەڕووی یەك بوونەوە. دەستیان کرد بە کوشتوبڕ و ابوالفتح خان شکا. دوای ئەو سەرکەوتنە، "میرزا ابوتراب" ناوێکیان لەوەچەی "شاە سوڵتان حوسەین" هێنا و ناوی "شاە اسماعیل"(٤٣) یان لێ نا، ئینجا کەریم خان بەناوی ئەوەوە دەستی کرد بەگرتنی وڵاتان و بەخۆی دەگوت "وەکیل".

پاش ماوەیەك "كەریم خان" ویستی بچێتە شەڕی "حەسەنعەلی خان" ی حاكمی كوردستانی ئێران و "محمد عەلی خانی تەكەلوو" حاكمی ناوچەی "عەلی شەكەر". [ئەوە بوو] كە لەشكری هێنایە سەریان، بەتەواوەتی تێكی شكاندن و لە ڕووپەڕی عیراق [ی عەجەم] دا، دەسەڵات و هێزی پێكەوەنا و دەستی كرد بە داگیركردنی وڵاتان. بەڵام تا ئەو كاتەی كە جەنابی فەلەك دەرگانەی بە شان و شەوكەت "محمد حەسەن خانی قاجار قۆیونلوو" ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە ژیاندا بوو، نەیتوانی هیچ كارێك بباتە پێشێ و لە هەموو شەڕ و كوشتار و پێكدادانێكدا، تووشی شكان دەهات.

بەهۆی ئەوەوە كە گەورە پیاوانی هۆزی لوڕ هەمیشە لەگەڵ حاكمانی كوردستاندا دوژمنایەتی و بەرهەڵستكارییان هەبوو، هەرئەوەندەی دەرفەتێكیان بۆ هەڵكەوتایە، یا حاكمانی كوردستان بەسەر لوڕیان دادەدا، یا تووشماڵەكانی لوڕ دەهاتنە سەر كوردستان و ئەوەی مایەی وێرانی وتاڵان و بڕۆ و كوشتن بوایە دەیانكرد.

وەك لەسەردەمی شاعەبباسی بەهەشتیدا، كاتێ خان ئەحمەد خانی حاكمی كوردستان و "شاوێردی خان" ی حاكمی لوڕستان هەردوكیان لە ئیسفەهان و لە خزمەت [ی شاە] دا بوون، ڕقەبەری و دژایەتی لەنێوانیاندا پەرەی

سەند، بەچەشنێك كە دوای گەڕانەوە بۆ شوێنی حوكماتی خۆیان، شاوێردی خانی لوڕ حەشیمەتێكی زۆری لە لوڕ و زەند پێكەوەنا و بۆ شەڕی خان ئەحمەد خان كەوتەڕێ.
خان ئەحمەدخان وزەی وەستانی نەبوو و خۆی لەقەلاّی "حەسەن ئاوا" دا - كە یەك فرسەخە ڕێ لەسنەوە دوورە، حەشاردا. شاوێردی خان گەمارۆی دان و دوای چەند شەوێك، خان ئەحمد خان بەجل و بەرگی گۆڕاوەوە و بێ ئەوەی شاوێردی خان بزانێ لە قەلاّی حەسەن ئاوا دێتە دەرێ و كۆمەڵێك كورد لەگەڵ خۆی دەبا و دەچێ بۆ لورستان. لەوێ، دەستی وێرانكەری و تالاّنی باش دەوەشێنێ و بە قەدەرایی ٥٠٠ بنەماڵەیەكی [لوڕ] ڕادەگوێزێ و لەخاكی كوردستان نیشتەجێیان دەكات.
هەرئێستاش نزیكەی حەفتا خێزان كە بەمەزننە سێسەد كەسێك دەبن، لە خاكی كوردستاندا ماون و هاوینەهەواریان دەخەنە "كەرەوز"(٤٦) و مەریوان و "كەمەرە"(٤٧) زستانیش هەر چەند خێزانێك لەیەكێ لەو گوندانەی شوێنەكە، دەمێننەوە. پاشماوەشیان وردە وردە چوونەتەوە خاكی خۆیان و ژمارەیەكیشیان پەڕیونەتە خاكی عوسمانی و لەناو هۆزی جافدا دەژین.
لەوانەی وا لە ئێرانن گەرچی دە پازدە خێزانێكیان بە "كلاّوكەر" ناویان دەركردوە، بەلاّم لە ڕاستیدا هەر لە

هۆزی لوڕن. هۆی ناونانیان به "کلاوکەر" یش ئەوەیەکە کلاوی لبادی کوردیی زۆر چاك دروست دەکەن و لە زاراوەی کوردیدا، کلاوکەر واتای "کلاودروو" دەداتەوە.

هۆی ناونانی هۆزی "لوڕ" یش روون نییە، گەرچی هەندێ کەس دەڵێن "لوڕ" ناوی باپیرەگەورەیان بووە و ئێستاش هەر بەناوی ئەوەوە نێوبانگیان دەرکردووە، خوازاناترە. لەناو ئەوانەشدا کە لەکوردستان نیشتەجێ بوون و ئێستاش هەرماون تا ئێستا کەسێکی ناوبەدەرەوەیان لێ هەڵ نەکەوتوە.

**سێهەم - هۆزی "ئەحمد زەینەڵ"**

[ئەم هۆزە] دەچنەوە سەر هۆزی «تیلەکۆ»(٤٨)، کە بەسەرهاتیان دواتر دەنووسین. زستان لەناوچەی ناسراو بە "کەرەوز" سەر بە کوردستان [سنه] لە ئاوابییەکان دادەنیشن  هاوینەهەواریان کوێستانی ناوچەی ناوبراوە. هەروەها زستانە هەواریان دەخەنە مەڵبەندی "سالار" لە کوردستان. نزیکەی شەست خێزانن و بەمەزندە دووسەد کەسێك دەبن. بەهۆی ئەوەوە کە وەچەی "ئەحمەد زەینەڵ" ن، بەناوی باپیرە گەورەیانەوە ناسراو و ناودێرن.

**چوارەم - هۆزی "ئیسماعیل غەدیری"**

لەسەرتای شاهیەتی خاقانی خوا لێخۆشبوو و شاهەنشای تاعەت قەبوولّ [فەتح عەلی شاهی قاجار]، خوا بەرگی نووری لەبەرکات و لە [سەردەمی] حکوومەتی خوالێخۆش بوو، "امان الله خان" ی یەکەمدا، کە نزیکەی هەشتا سالّ پێش ئێستایە، لەلای بەغداوە هەلاّتوون و هاتوونەتە خاکی کوردستانی ئێران.

چەند سالّێك لە کوردستان ماونەتەوە و پاشان لەسەردەمی شاهیەتی شاهەنشای عالەم پەنا و بەهەشت جێگا - «محمد شاه» دا،خودا خاکی قەبری خاوێن رابگرێ و لە حکوومەتی ئەمان اللە خانی دووهەم(٥١) دا، نزیکەی چوار سەد خێزانیان هەلاّتوون و چوونە تەناو هۆزی جاف لەخاکی عوسمانی.

نزیك بەسێسەد بنەمالّەشیان لەخاکی کوردستانی ئێران مابوونەوە کە ئێستا سێ سالّێك دەبێ پەنجا خێزانیان هەلاّتوون و چوون لەگەرووس(٥٢) ی هەوشار(٥٣) جێگیر بوون، بیست خێزانێکیشیان لە "هۆبەتو" نیشتەجێن کە هەرسێ ئەو شوێنانە خاکی کوردستانی ئێرانن. بەمەزندە ئەو سەد بنەمالّەی وا [لە ئەردەلاّن] ماونەتەوە، چوارسەد کەسێك دەبن.

هۆی دانانی ناو: چون لە وەچەی ئیسماعیلی کوڕی

غەدیرن، بە "ئیسماعیل غەدیری" ناویان دەرکردوە.

**پێنجەم - هۆزی "ئاخە سووری"[ئاغە سورە]**

ئەم تیرەیە، سەربەهۆزی "مەندەمی" ن کە لە دواییدا باسیان لێوە دەکەین. بەمەزندە پەنجا بنەماڵەیەك دەبن و ژمارەیان دەگاتە دووسەد کەس. هەندێکیان چوار فەسڵە لەکوردستان دەمێننەوە و بەشێکیان زستانان دەچن بۆ گەرمێن.

**شەشەم - هۆزی ئیناخی(٥٤)**

نزیکەی پەنجا خێزانێك دەبن و لە ناوچەی "جوانڕۆ"، کە سەر بە کوردستانی ئێرانە، نیشتەجێن. رەعیەتی باج بدەریان کەمە و زۆربەیان بەگزادەن. لەوەڕگە و مەزرا و باخیان لەناوچەی پاوە هەیە کە عاید بە جوانڕۆیە. هاوینان لە چیای "شاهۆ"، کە [هەمان وشەی] "شاهکووە" بێت، هەوار دەخەن و زستانە هەوارییان دەبەنە "مەڕە خێڵ" و "هەوارەمچی". ژمارەی دووسەد کەسێك دەبن؛ تیرەکەیان هۆزی جاف دەگرێتەوە وئێستا، کوێخایەکی ناسراویان نییە، هۆی ناودانان: چون باپیرەگەورەیان "ئیناق بەگ" بوە، بەوناوەوە ناسراون.

**حەوتەم ـ تیرەی {عیلە ڕووتە}(٥٥)**

سەردەمی زوو، هۆزێکی بەڕێز و پایە و دەوڵەت و ماڵ بوون و سەرۆك و مەزنیان لە هەر سەردەمێکدا کەسێك بوە و ئەمانیش بەناوی ئەوکەسەوە ناودێرکراون: هەندێ جار بەرەعیەتی "وەلەد بەگی" و زەمانێك بەناوی "عێلی سەمەدی" ناوبراون. ئێستاش بە هۆی گەردشی چەرخەوە، هێند سواڵکەر و هەژارن کە ناوی "عێلەڕووتە" یان لێناون و ئەوەش بەکوردی واتای هۆزی رووت و قووت دەداتەوە.

لە عەشیرەی مەحاڵی جوانڕۆن و ئێستا بیست خێزانێك دەبن و بەمەزندە سێسەد کەسیان لێ ماوەتەوە. زستانە هەواریان لە "هەردی" یە کە کەوتۆتە سەر ئاوی سیروان. ئەم هۆزە، هیچ کاتێ "قەیخا" یان لە خۆیان نەبوە و ژێردەستی هۆزی "ئیناخی" بوون.

**هەشتەم ـ هۆزی "ڕەحمان بەگی"**

ئەم هۆزە لە ڕابوردوودا، چوار تیرە بوون: مستەفایی، دووڕوەیی، بەیانی و بێسەری. هۆی دانانی ناوەکان: ئەوانەی وا مەزنیان مستەفای ناو بوە، بە مستەفایی ناسراون. «دووڕوە» ش شوێنێکە لە جوانڕۆ و ئەو تیرەی وا هەواری زستان و هاوینیان بردۆتە جوانڕۆ، بە

"دووڕۆیی" ناویان دەرکردوە. بەشێکیشیان لە تۆرەمەی "بەیان" ناوێك بوون و بەناوی باپیرەگەورەیانەوە ناونراون: ئەوانەش وا مەزن و کوێخایان نەبوە، بە "بێ سەری" ناسراون.

هەر لە سەردەمی زووەوە، لەناو هۆزی جافدابوون و خۆیان بە "برایم بەگی وەکیل" ەوە دەبەستنەوە کە سەد و پەنجا ساڵێك لەمەوبەر حاکمی جوانڕۆ بوە.[پاشان] لە جوانڕۆ کۆچیان کردوە و لە مڵکی ئەو خوالێخۆش بوە دا گەرمێن و کوێستان دەکەن. ئێستاش بەهۆی هەژارییەوە پرژ و بڵاو بوونەتەوە و هەندێکیان چوونەتە هاوینەهەواری "روانسەر" کەناوچەیەکی کوردستانە و بەشێکی دیکەیان پەڕەوازەی "ماهیدەشت "ی کرماشان بون.

شەش خێزانیان لە گوندی "کەلاتی" ن کەمڵکی بەڕێز "ئەمان الله خانی وەکیل"ە و هەشت نۆ خێزانیان هاوینان لە شاخی "وەزنە" مالآت دەلەوەڕێنن و زستان لەگەڵ خێلآتی دیکەی کوردستان دەکەون و دەچن بۆ زەهاو. لقی "بێسەری" یان، چەند خێزانێکی چۆتە ناو هۆزی "کەشکی" یەوە کە دواتر باس لێوە دەکەین و لەگەڵ ئەوان کەوتوون.

**نۆهەم ـ تیرەی ئیمامی**

لە تۆرەمـــەی "ئـیـمــام" ناوێکن و بەهۆی ئەوەوە ئەم ناوەیان لێ نراوە، ئەم عەشیرەتە بەشێکن لە حەشیمەتی "یەزدان بەخشی" و عاید بەوانن. [بەلام] هەرکاتێ یەزدان بەخشییەکان هەڵێن و بچن بۆ خاکی عوسمانی، ئیمامیەکان ئیتاعەیان ناکەن، واتە لەگەڵیان ناچن و لەناوچەی "جوانڕۆ" دادەمێننەوە. ئێستاش بەشێك لەعەشایری جوانڕۆن و لەگەڵ جافەکانی جوانڕۆ دێنە هەژمار.

نزیکەی حەفتا خێزان و بەمەزندە سێسەد کەسێك دەبن. کوێخای ئێستایان «محمد خان بەگ کوڕی مەحموود ئاغا» یە، لەوەڕگە و مووچە و مەزرای بەهار و هاوینیان، زۆزانی "میکوری" و "لاران" ە و شوێنی لەوەڕ و تەویلەی پایز و زستانیشیان مەڵبەندی "دڵەدەرە" و "دڵ ئۆرا" یە کە بەشێکن لە خاکی ناوچەی جوانڕۆ.

## مەتڵەبی دووهەم

باسی ئەو حەشیمەتانەی کە پیتی یەکەمی[ناویان] "ب" یە

**یەکەم - هۆزی باوەجانی**

لە تۆرەمەی "باوەجان" ناوێکن و [بەهۆی ناوی ئەوەوە] بە "باوەجانی" ناودێرکراون. لە ڕابوردوودا، بە بەشێك لەهۆزی جاف دەژمێرران. شاراوە نەمینێ کە هەموو عێلی جاف لە ڕابوردوو و سەردەمی زوودا رەعیەتی ناوچەی جوانرۆ بوون کەیەکێکە لەناوچەکانی کوردستانی ئێران و گەورەترین هۆزەکانیان بریتین لە : "غیزاوی"،"گەلاڵی"، "یەزدان بەخشی"، "میکاییلی" و "نەورۆڵی".

زۆربەی مەزرا و لەوەرگەی هاوین و زستانیان بریتیە لە ئاواییگەلی "بلەبزان" و "گەلاڵ" و "کلاش" و "نەورۆڵ" و "سریاس" کە گوندی ناوچەی جوانرۆن و پاشان بەپێی چەرخی زەمانە هەڵاتوون و زستانیان لەگەرمێنێ "زەهاو"

و هاوینیان له کوێستانەکانی کوردستانی ئێران بردۆته سەر، تا ئەوەی نزیك بەدە دوازە ساڵ لەمەو پێش، هاتنی ئێرانیان لێ یاساخ کراوە.

تەنانەت عەشیرەی "یەزدان بەخشی" نزیك به پەنجاساڵ دەبێ چوونەته ناوپاشماوەی عێلی جافەوە. پێش ئەو پەنجا ساڵە، زستان و هاوینیان لەناوچەی جوانرۆ [بردۆتەسەر] و رەعیەت و باج بدەرێ ئەوێ بون. ئێستاش هەندێ لەو هۆزانەی وا لەخاکی جوانرۆن و باجی ئەوێ دەدەن - وەك پێشتر باسی هەندێکیان کرا و بەشێکی دیکەیان دواتر باسیان لێدەکرێ، هەموو پاشماوەی هۆزی جافن بەڵام سەریان لەوان وەرگێڕاوە و له جوانرۆدا ماونەتەوە.

ئێستاش شوێنەوارو نیشانەی هەوارگەی گەرمێن و کوێستانی "ظاهر بەگ" باپیرە گەورەی محمد پاشای جاف کە ماوەیەك لەمەوپێش پەنای هێنایە بەر دەوڵەتی پایەبەرزی ئێران و لەلای دەوڵەتی شکۆدارەوە مەحاڵی زەهاو و ناوچەی جوانرۆ واته سەحرای "کریوە"و دەشتی "سەریاس" ی خەڵات کرا، لەخاکی جوانرۆ دا ناوی ماوە.

ئەم هۆزی باوەجانییەکە ئێستا گرنگترین رەعیەتی ناوچەی جوانرۆن، هەر بە هۆزی جاف دەژمێردرێن و ئێستا، نزیکەی حەوسەد یا هەشت سەد خێزانن و دەبێ

سێ هەزار کەسێك ببن. هاوینان لە کوێستانی جوانڕۆ و زستان لەهەوارگەکانی سنووری ئێراندا دەسووڕێنەوە.
گەورە و سەرەك خێڵیان "حەبیب بەگ" ە کە دووساڵ لەمەوبەر لەلایەن حاکمی کوردستانەوە [ئەم حاکمی کوردستانە، دەبێ محمودخانی ناصرالملك یا محمدخانی اقبال الملك بووبێ]، سەرۆکایەتی و حوکماتی ناوچەکەی پێ سپێرراوە، نزیکەی دووسەد خێزان لەو حەوسەد هەشتا خێزانە، پێشتر بەناوی " قوبادی" یەوە ناسراون [بەڵام] لەبەر ئەوەی تێکەڵاوی هۆزی باوەجانی بوون و چوونە ژێر مەنسووبیەتی سەر خێڵی باوەجانییەوە و بۆ ماوەیەکیش لەگەڵیان کەوتوون، ئێستا بەکردەوە وەك باوەجانی دەناسرێن. زستان و هاوین لە نزیك لەوەرگەی باوەجانی، لەوەرگەی تایبەت بە خۆیان هەیە کە کوێستانی "بازان" و "بەنی کور" و "نەهراب" ی خاکی جوانڕۆ بێت، لەوەرگەی بەهار و هاوینیانە و "کوە شێخان" ی زەهاویش لەوەرگەی زستانیانە.

**دووهەم - تیرەی "بەراز"**

باپیرەگەورەیان ناوی "کەهیا صالح"بوە و پێشتر، لە زاراوەی وڵاتی عوسمانیدا "کەهیا"یان لەباتی وەزیر بەکار دەهێنا. لە سەردەمی حکوومەتی ئەمیری مەزن "ئەمیر

تەیموور" دا، کەهیا صالّح نزیکەی دوو سێ هەزار خێزان ڕەعیەتیانی لە "ئۆرفە" ی خاکی عوسمانی ڕاگوێستن و لە خاکی کوردستانی ئێران دای مەزراندن: هەندێکیان لەناوچەی "هۆبەتوو"(٥٨) و "قەرە-تەوەرە"(٥٩) و بەشێکیان لە مەریوان [نیشتەجێ کران]. پاشماوەشیان ژیانی دەوارنشینیان هەڵبژارد و هەواری هاوینی خۆیان دەبردە کوێستانەکانی کوردستانی ئێران و زستانە هەواریشیان دەخستە گەرمێنی زەهاو.

زۆرجار، سەرەك عێل و خاوەن دەسەڵاتی هەموو هۆزەکانی کوردستان لەم هۆزە هەڵکەوتوون و بەتێپەڕبوونی زەمان، کەسانی ناودار و لێهاتوو لەناویاندا پەیدا بوون. لە شاری سنە بینای گەورەیان دروست کردوە و مڵکی زۆریان کڕیوە. لەوانە، یەکێکیان "حاجی یەعقووب بەگ "بوە، کە لە سەردەمی دەسەڵاتداری ئازادخانی ئەفغان(٦٠) دا، سەری دانەنەواندوە و دژایەتی و بەربەرەکانی [ئەفغانییەکانی] کردوون. لە ئەنجامدا، ئازاد خان دەرفەتی لێ هێناوە و گرتوویە و کوشتوویەتی.

یەکی دیکەیان محمد باقر بەگ بوە، کە خۆی و "حەسەنعەلی خان" ی حاکمی کوردستان، بەتوندی لەگەڵ کەریم خانی زەند دا تێکەوتوون و شەڕی زۆریان لەگەڵدا کردوە. چەند ناوداری دیکەش وەکوو "عبداللە سلطان" و...

هتــد، لەناو ئەم هۆزە هەڵکەوتوون کــە نایب و وەکــیلی کــوردســتــان بوون، بەڵام پاشــان بەگــوێرەی زەمــان و بە تێپــەڕبوونی ســەردەم، ئەم هۆزی " بەراز" ە، بڵاوەی کـردوە، هەندێکیان هەڵاتوون و گــەڕاونەتەوە خـاکی عوسـمـانی(٦١) هەندێکی دیکەشیان ژیانی کۆچەرییان وەلا ناوە و چل ساڵێك دەبێ لە هەندێ ئاوایی کـوردسـتـانی ئێراندا، خانووبەرەیان دروست کردوە و دانیشتوون و خەریکی کشت و کاڵ وئیشی رەعیەتین.

وەك لە گــوندی "کـپك" دا ســەد خــێزانێك دەژین کــە ســەرجــەم دەگــەنە ٥٠٠ کــەس و لـە ئاوایی "عــەباس جـوب" لەناوچەی "ئێلاق"، نزیکەی ٦٠ خــێزان و هەروەها لە گـوندی «گامـێشانی ئیـلاق»، ٢٠ خـێزان و لە " بولغـوز ئاغـاج" ی ناوچەی «ئیــســفــەند ئاباد» ٣٠ خــێــزان و لـە ئاواییگەلی دیکەشـدا هەندێکیـان نیـشـتـەجێ بوون و خـەریکی ئیش و کاری کشت و کاڵ و رەعیەتین.

ئێــســتــاش هەندێکیــان لە گــوندی "قــەرەتەوەرە" و دەوروبەری کە پاشماوەی مڵکەکانیانە، خەریکی مڵکدارین و بەشـێکی تریان ئەوا چەندەها ســاڵە لەشــاری سنە ئیــشی نۆکـەرایەتی حـاکـمـان و گـەورە پیـاوانی وڵات دەکـەن. لەم عــەشــیــرەیە، ئەوانەی وا لەســەر رەوشــتی عــەشــیــرەتی مابێتنەوە، نزیکەی سەد خێزانێکن کە زستانان لە گوندی

"دکن" و... هتد، سەربە کوردستان [ی ئەردەڵان] دەمێننەوە و هاوینان لە هەواری دەوروبەری ئەوێ، لە رەشماڵاندا دەژین.

هۆی دانانی ناوی "بەراز" لەسەر ئەم هۆزە ـ بەچەشنێك کە دەگوترێ، ئەوەیە لەکوردیدا بەراز بەواتای "خنزیر" ە و زۆربەی ئەندامانی ئەم هۆزە لەکاتی شەرکردندا وەك بەراز روویان کردۆتە دوژمن و نەگەڕاونەتەوە دواوە، جا ناوی بەرازیان لێناون و بە هۆزی «بەراز» ناویان دەرکردوە[؟]. کوێخا "جوامێر" ناوێکیان لەگەڵ خوالێخۆشبوو "ئەمان الله خانی والی" چۆتە ڕاو؛ راوچی لەکاتی راودا، بەرازێك دەگرن و دەیهێننە بەردەم والی، ئەویش فەرمان دەدات بەشمشێر بیکووژن. لێرەدا، کوێخا جوامێر لە ئەسپەکەی دادەبەزێ و عەرزی والی دەکات ئێمە "بەراز" مان پێ دەڵێن و ئەوەش بەرازە، لەغیرەت و ئازایەتی عێلایەتی ئێمە بەدوورە لەبەر دەمم بیکووژن و من بێدەنگ دانیشم و تکای بۆ نەکەم. سەد تمەن پارە بەرەسمی پێشکەش ئامادە دەکەم و دەیهێنمە خزمەتت بۆ ئەوەی دەست لە کوشتنی ئەم بەرازە هەڵبگری. والی ئەم تکا و پێشکەشیەی لێ قەبووڵ دەکا و دەفەرموێ بەرازەکە بەڕەڵڵاکەن.

**سێههم ـ بهلیلهوهند**

به گوێرهی قسهی کوێخا و ریش چهرمگی خۆیان، ئهم هۆزه، لقێکی ئهحمهد [وهند] ن، که بهشێکیان له کرماشان و ههندێکیان له ولاتی عوسمانی - نێوان سلێمانی و کهرکووك، ههندێ جار له ئاواییدا دادهنیشن وجاروباریش دهوارنشینی دهکهن.

ئهم هۆزی "بهلیلوهند" ه، ئێستا نیشتهجێی کوردستانی ئێرانن و نزیکهی دووسهد خێزانێك دهبن که رهعیهت و باج بدهرن و نزیکهی ههزار کهسێکن؛ روونیش نییه کهی هاتوونهته ئێران.

کوێخای ئێستایان، قهیخا "شاهباد" ه و هۆی ناونرانیان ئهوهیه که وهچهی "بالۆولۆ" ناوێکن لهزمانی کوردیشدا، وشهی "بهلول" دهگۆڕن و دیهکهن به "بهلیل"[؟] و بهم شێوهیه، پێیان دهڵێن بهلیلهوهند. زستانان له گهرمێنی "گاوهرۆ" دهبن، که گهرمهسیری "فهقێ سولهیمان" و "ههنگوران" ی پێ دهگوترێ و عاید بهمهڵبهندی "گاوهرۆ" یه، که [ئهم وشهیهش] کورتکراوهی "گوارا روود" بێت. هاوینهههواریشیان له شوێنی ناسراوی "ئێلاخ" ه، که ئهویش سهربهکوردستانی ئێرانه.

**چوارەم ـ تیرەی بۆرەکەیی**

سەد و پەنجا خێزانێکن و بەمەزندە ٦٠٠ کەسێك بە ژن و پیاو و گەورە و بچووکەوە دەبن. زستانان لە گەرمێنی زەهاو و هاوینان لە مەحاڵی "ئیسفەند ئاباد" ی کوردستانی ئێران، واتە لە شاخ و کێوی "دیهەج" و "کونکرە" دا، مەڕ دەلەوەڕێنن. ئەم هۆزە، لقێکی هۆزی "مەندەمی" ن کە دواتر سەربەوردیان دەنووسین. تیرەی ناوبراو، نزیکەی سەد ساڵێك دەبێ بەهۆی نێوان ناخۆشییەوە لێیان جیابوونەتەوە.

لەبەر ئەوەی بۆرەکەیی وەچەی "بەبرەك " ناوێکن و "بەبرەك" یش لە زمانی کوردیدا دەگۆڕێ و دەبێتە "بەورەك"، ئەم ناوەیان لێ نراوە. کوێخای ئێستایان "کوێخا بوداق" ە و هیچ کەسێکی ناسراو و ناوبەدەروەیان لێ هەڵنەکەوتوە.

## مەتڵەبی سێهەم

### باسی ئەو هۆزانەی وا پیتی یەکەمی ناویان "ت" یە

**یەکەم ـ تاوەگوێزی(٦٢)**

ئەم هۆزە، لە زومرەی ساداتی پایەبەرزی "پیرخضری" ن، کە پێشتر خێڵێکی زۆر گەورە و خاوەن قەدر و ڕێز

بوون و به درێژەی ڕۆژگار و ساڵ، زۆربەیان هەڵاتوون و لە سلێمانی و شارەزوور گیرساونەتەوە،[بەچەشنێك] کە ئێستا[تەنیا] پەنجا خێزانێکیان لەناوچەی جوانڕۆ ماونەتەوە و ئەوانیش لەخزم و کەس و کاری «حەبیب بەگ» ی سەرەك عێلی باوەجانین کە پێشر باسی لێوەکرا و هەر لەژێر چاوەدێری ئەویشدا دەژین. کوێخای ئێستایان، قەیخا "یۆسف" ە و لەوەڕگەی بەهار و هاوینی [مەڕو ماڵات] یان کوێستانی "لەلەخول" و سەحرای "پلك" لە ناوچەی جوانڕۆیە و زستانیان لە "بانی ناز" و "شێخ اسماعیل" لە شوێنێك بەناوی "خان عاشوور" دەبەنەسەر.

خوالێخۆشبوو "مەلاعەبدالرحیم" ناسراو بە "مەولەوی" لەم هۆزەیەکە زانایەکی بەکردەوە ئەدیبێکی تێگەیشتوە و جامیعی علوومی مەعقوول و مەنقووله. مرخێکی بەهێز و تەواوی شیعری هەبوە. شیعرەکانی لەزمانی کوردی دا وەك شیعری شێخ [ی سەعدی] و خواجە [حافظ] ن لە زمانی فارسیدا - رحمەتی خوایان لێ بێت، یاخود وەك "امرءالقیس" و "عنترە" لە عەرەبی دا. ناوبراو دووسێ ساڵ لەمەوپێش کۆچی دوایی کرد [ساڵی کۆچی دوایی مەولەوی بە۱۸۸۰دەزانرێت].

هۆی ناونرانیان بە تاوەگوێزی، دارەگوێزێکی پیری ئەستوورە لەناوچەی "قشلاق" کە خێڵی سەیدەکان گەلێ

جار، لەژێر سێبەریدا کۆبوونەتەوە و باس و قسە و ڕا وتەگبیریان کردوە و هەر بەو هۆیەوە بە تاوەگوێزی ناسراون. سەیدانی "پیرخضری" کە ساداتی تاوەگوێزی لەوانن، هۆزێکی گەورەی بەپایە و ڕێز بوون و بەشێك لەساداتی کوردستانی ئێران و عوسمانی لەو خێڵەن.

گەلێك زانا و پیاوچاکی بەشان و شکۆ لەناویاندا هەڵکەوتوون و لەوانە "سید حسن" ناسراو بە "مەلا ابوبکر مصنف"(٦٤) ە کە باسی زانست و فەزیلەتی ئاشکرا و نهێنی ئەو، لە سەر زمانی خەڵك و لە توێی کتێب و پەرتووك دا کراوە، بەشێك لەو کتێبانەی وا دایناون بریتین لە "وضوح" (فقەشافعی) و "ریاض الخلود" و "سراج الطریق" (سۆفیایەتی و سلوك).

کوڕەکەی واتە "مەلا عەبدولکەریم(٦٥) یش لەزانایانی پایەبەرز و خاوەن کتێب بوە. لەوانە: انذار الاخوان" (وەعظ) و "واضح" (لە تەفسیردا) یە.

هەروەها، نەوەی ئەو خوالێخۆشبوەش - کەناسراو بە "مەلا جامی"(٦٦) یە، خاوەنی نووسراوە و دانراوەیە و لە زۆر زانستدا شەرح و پەراوێزی هەیە. سەیدەکانی بە پایە و ڕێز و ناسراوی ساوجبلاغی موکری [«مەهاباد»ی ئێستا]، لەتۆرەمەی ئەون و نازناو و پایەی "شێخ الاسلامی" ئەو ناوچانە، هی ئەوانە. ئێستاش لەناوچەی

مەریوان کە سەر بە کوردستانی ئێرانە "سید حسن" ناوێك دەژی کە بە زێوەری زانست و عیلم رازاوەتەوە و قازی و دەرس بێژی ناوچەکەیە و خەڵك، رووی تێ دەکەن.

**دووهەم ـ هۆزی تاری مرادی**

چون لەتۆرەمەی "تاری مراد" ناوێك بوون، ئەو ناوەیان پێ دراوە. بەشێکن لە هۆزی "مەندەمی" کە دواتر، سەربهوردیان بە دوور ودرێژی دەگێڕینەوە. نزیکەی چل ساڵێکە بەهۆی نێوان ناخۆشی و دڵ ئێشانەوە لە هۆزی ناوبراو جیابوونەتەوە و لەوەرگە و بەهارگەی کۆنی خۆیان بەجێ هێشتوە و هاتوونەتە "ئێلاخ" ی کوردستان و شوێنێك بەناوی "تەقارەخان" و "کانی درێژ" بۆتە زستانە هەواریان. بەمەزندە، سەد خێزان و چوارسەد و پەنجا کەس دەبن. کوێخایان "محمد" ناوێکە و لەناویاندا هەتا ئێستا کەسێکی ناودار هەڵ نەکەوتوە.

**سێهەم ـ هۆزی تیلەکۆ(٦٧)**

نزیکەی دووسەد ساڵ دەبێ لە "قەترە" و "بوار" ەوەکە لە ناوچەی نێوان کەرکووك و بەغدای خاکی عوسمانی هەڵکەوتوون، هاتوونەتە کوردستانی ئێران و لەناوچەی "باشماخ" کە بیست و دوو ـ سێ گوندێك دەبێ نیشتەجێن و

پاشان هەندێکیان پەرەوازە بوون، ٢٥٠ خێزانێکیان چوونەتە بانە- مەحالی "دەشتاڵ" کە بەشێکە لە ئەیالەتی کوردستانی ئێران. نزیکەی ٥٠ خێزانێکیش لەگوندی "چرەچرە" ی ناوچەی "پڵینگان" نیشتەجێ بوون و سێسەد خێزانێکیان هەڵاتوونەتە ناو عێلی جاف و شارەزوور کە بەمەزندە سێ هەزار کەسێك دەبن و لەناوچەی "باشماخ" ی ناوبراو، دامەزراون، واتە زستانە هەواریان لەوێ دەخەن و بۆ هاوینە هەواریش دەچنە "هۆبەتوو" ی کوردستان.

زۆر گوندی ناوچەی باشماخ، مڵکی کوێخا و مەزنی ئەم هۆزەن . عەشیرەتێکی ئازا و دەهەندە و میوانداو و خاوەن سفرەن و خوالێخۆشبووی پیاوی چاك، "عەزیزخانی سەردار کل"(٦٨) ژنی لێ خواستوون و کچی "کوێخا عوسمان" ی [مارەکردوە](٦٩) کە کوێخایەکی بە پایە و ڕێزی ئەو هۆزە بوە و جەنابی مقرب الخاقان "سیف الدین خان" لەو دایکە بوە.

گەرچی هەموو ئاواییەك کوێخایەکی خاوەن ئیعتیباری لەو خێڵە هەیە، بەڵام مەزنی هەموو هۆزەکە "حەسەن بەگ" ناوێکە لە تۆرەمەی «محمد بەگ». "محمد بەگ" یش کەسێکی خاوەن ناوە، چون لەگەڵ "کەریم خانی زەند" دا، پەیمانی برایەتی بەستوە و سەردەمێك لەکوردستان خەریکی چەتەگەری بوە.

پاشـان بەگـوێرەی چەرخی ڕۆژ و شـەو، کـەریم خـان بە وەکیلی و ئەمیریی ئێران دەگات، خوسرەو خانی والی لەسەر کار لادەبرێ و لە شیراز ڕادەگیرێ. نزیکان و خزمەتکاران وا بەباش دەزانن سـەرلەنوێ خـوسـرەوخـان بکرێتـەوە مەئموووری کوردستان. مەسەلەکە عەرزی کەریم خان دەکەن، ئەویش دەڵێ ئەم کارە بەستراوەتەوە بەوەی خاڵۆ محمد بەگ مـەسـڵـەحـەتی بزانـێ و پەسندی بکات یان نا، دەبێ بزانین ئەودەڵێ چی؟ هەواڵەکە بە "محمد بەگ" ڕاگەیێنرا و ئەویش پەسندنامـەکـەی نووسی و بەگـوێرەی قـۆڵ کـێـشـانی ئەو، بڕیاری حکوومەتی خوسرەوخان درایەوە. هۆی دانرانی ناوی هۆزەکە روون نیە و خوا زاناترە.

## مەتڵەبی چوارەم

باسی ئەو هۆزانەی وا پیتی یەکەمی ناویان "د" ە

**یەکەم ـ هۆزی دوڕاجی**

نزیکـەی سـەد خـێزانێکن و ژمـاریان بەمـەزندە دەگـاتە چوار سـەد کەس. بەزسـتان لەناوچەی گاوەرۆ و لەگوندێك بەناوی "رەزوان" و شـوێنی تر مـەڕ و مـاڵات دەلەوەڕێنن و

هاوینان له شوێنیك بەناوی "کانی گوڵزار" هەوار دەخەن. کوێخای ئێستایان قەیخا "عەبدالرحمان" ە و چون له تۆرەمەی "دوراج" ناوێکن، بەوناوە ناسراون. هەندێ لەم خێڵە بڵاوەیان کردوە و لەخاکی گەڕووس و کولیایی دەژین.

**دووهەم - خێڵی دۆم**

هۆی ناونرانیان روون نیە. نزیکەی دووسەد خێزانێك دەبن و بەمەزندە ٥٠٠ کەسێك دەگرنەوە. ئیش و کاریان تەنیا کلاش کردنە. بەشێکیان دانیشتووی شاری سنەن و لەوێ ماڵیان هەیە. بەشێکی دیکەیان زستان لە گوندەکانیاندا دەمێننەوە و بەهار و هاوین بەگوێرەی کات و وەخت، دەگەڕێن و باجی دیوەخان و بژیوی خۆیان هەر لەو پیشەی کلاش کردنە پێك دینن. لەناویاندا، هەتا ئێستا کەسانی ناسراو و ناوبەدەرەوە هەڵ نەکەوتوون.(٧٠)

# مەتلەبی پێنجەم
## باسی ئەو هۆزانەی وا [پیتی] یەکەمی ناویان "ز" یە

**یەکەم - زەردوویی**

چۆن باپیرەگەورەیان نەخۆشی زەردوویی گرتوە و بەهۆی نەخۆشییەکەوە رووی زەرد هەڵگەڕاوە، بە "زەردوویی" کە کورت کراوەی " زەردڕوویی" یە، ناوی دەرکردوە و تۆرەمەکەشی، هەر بەناوی ئەوەوە دەناسرێن. ئەم هۆزە دەکرێن بە چوار بەشەوە و هەر لقێك ناوێکیان هەیە:

یەکیان بە «ساتیاری» دەناسرێ و ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە باپیرەگەورەیان سەعاتی هەبوە وئەم لقە، بەوەوە نیسبەتیان دراوە. لە زمانی کوردیدا، [وشەی] سەعاتداری یان تووشی ئاڵ و گۆڕ کردوە و ناوی "ساتیاری" یان لێناوە.

یەکی دیکەیان، هۆزی «کەمانگەر» ە(٧١) کە ئێستا بەشێکیان لەشاری سنە دەژین و بەشێکی دیکەیان لە ئاواییگەلی کوردستاندا بڵاو بوونەتەوە و ئیشیان نۆکەرایەتی کردنی حاکمان و گەورە پیاوانی شارەکەیە. لەم هۆزە، "مەلا ئەحمەد" ناوێك هەڵکەوتوە کە زانا و ساڵکێکی تەریقەی نەقشبەندی بوو و مزگەوت و خانەقای لە گوندی

"کوکسارد" دروست کردبوو چەند موریدێکیشی هەبوو. دوای مردنی ئەو، کوڕەکانی هەمان شێوەیان گرتۆتەبەر و بەهەمان ڕێبازدا دەڕۆن.

لقێکی دیکەیان بە «ڕوانی» ناوبانگیان دەرکردوە، ئەویش لەبەر ئەوەی مەزرا و لەوەرگەیان لە گوندی "ڕوان" ی جوانڕۆیە وئێستاش هەر لەو دێیە نیشتەجێن و باخاتیان ناوەتەوە و بونەتە گوندنشین.

لقێکی دیکەیان بەناوی «شاقوباد» ی باپیرەگەورەیانەوە ناونراون. ئەم لقە، لە ئاواییگەلی ئەیالەتی کوردستاندا، بڵاو بوونەتەوە و خێوەت نشینیان وەلاناوە و لە خانووبەرەدا دادەنیشن.

لەم هۆزی زەردووییە، ئێستا نزیك بە دووسەد خێزان لەناوچەی "فیض اباد" ی کرماشان نیشتەجێن و خەریکی بازرگانین. سەد خێزانێکیان هەڵاتوون بۆ شارەزوور و[لەوێ] دامەزراون و خەریکی کشت و کاڵن. نزیکەی پەنجا خێزانێکیش کە بەمەزندە دووسەد کەس دەبن، لەخاکی جوانڕۆدا بەحاڵی دەوارنشینی ماونەتەوە و لەوەرزی بەهار و هاویندا لە کوێستانەکانی جوانڕۆ ـ ناسراو بە "سەردەخانی" و "ویراش" و "تین دوزەپوچ" [؟](٧٢) و "دەرەنیان" مەڕ و ماڵات دەلەوەڕێنن و لەوەرگەی پایز و زستانیان لەسەر ئاوی سیروانە بەناوی "ئەنجیرەك" و "ڕوان".

**دووهەم ـ هۆزی زەندییە**

باسی ئـەم هـۆزە بەهـۆی "کـــــەریم خـــــانی زەند"و [زەندییـەکان] ی دیکەوە کـەوتۆتە ناو زۆر کـتـێبی مـێژووی ئێـرانەوە. نزیکەی چوار سـەد خـێـزانیـان لە ئاواییـگەلی کوردسـتان کـە بریتی بن لـە "ماچکە" و "ئالـێ پینەك"(٧٣) و "قەلا پۆلا"(٧٤) و... هتد، نیشتـەجێن و خەریکی ئیشی کشت و کالن. بەلام پێـشـتـر رەسمی خـێوەت نـشـیـنـیـان هەبوە و گـەرمـێن و کـوێسـتـانـیـان کـردوە. دوای تێکچـوونی دام و دەزگای "نادر شا" و"عەلی شا" و "ابراهیم شا"، حـەسەن عەلی خـان حـاکـمی کـوردسـتـان لەوێی راگـوێسـتن و لە "ئێـلاخ" ی کوردستانی دانان؛ لەو کاتەوە تا ئێستا لەوێ دەژین.

تەفسیلی ئەم کورتەیە، بە شێوەی خوارەوەیە:

"مـیـهـر عـەلی خـانی وەلا شـجـیـردی" دراوسـێی هۆزی زەندییە بوو. "زەند" ەکان لە [گوندی] «پەریە» دادەنیشتن و هەمـیـشـە خـەریکی وێرانگەری لە ناوچەی "عـەلیـشـەکـەر" و تالان و برۆ لەمـلکەکـانی "مـیـهـر عـەلی خـان" بوون و هـیـچ درێغییـەکیـان لە ئازار و زیانگەیاندن و کوشت و بڕ و تالان نەدەکـرد. مـیـهر عـەلی خـانیش کە توانای وەسـتـانی نەبوو، لەڕووی ناچارییەوە ناوچەی خۆی بەجێ هێشـتـبوو و پەنای بردبووە بەر "حـەسەنعەلی خان" حاکمی کوردستان.

لەو سەردەمەدا، هێشتا پادشاهێکی سەربەخۆ و دەسەڵاتدار و حوکمێکی [سەقامگیر] لە ئێران نەبوو و جیا لە خەڵکی کوردستان، نزیکەی پێنج شەش هەزار سوارەی ئەفغانی و چواردۆڵی(٧٥) و کولیایی و هەندێ "ئاژاوەچی" ی تر، بە دەوری حەسەن عەلی خانەوە وەکۆ ببوون و[ئەویش] کە دەسەڵاتێکی بەخۆیەوە دیبوو، بە ئامانجی تۆڵەسەندنەوە لە میهر عەلی خان و وەرگرتنەوەی مڵکەکانی، لە سنەوە کەوتە ڕێ و کاتێ گەیشتە ناوچەکە، سەرۆکانی زەند وەك کەریم خان و "شێخ عەلی خان" و ئەوانی تر، بەسوپای زۆر و ئەوپەڕی ئامادەییەوە لەبەرانبەریدا، وەستان.

بەیەکدادانی دوو سوپا، لە ساڵی ١١٦٣ [=١٧٤٩-٥٠] رووی دا. پاش هەوڵ و تێکۆشانی زۆر، لەشکری حەسەن عەلی خان سەرکەوت، سوپای زەند تێك شکا و لەبەریەك چوو. ژمارەیەکی زۆر لەناودارانی زەند کوژران و روویان کردە وڵاتی نەبوون. [ئێنجا حەسەن عەلی خان] مڵکەکانی میهر عەلی خانی بۆ ئەستاندەوە و بەوپەڕی سەربەخۆییەوە لەسەر کاروباری خۆی داناوە. نزیکەی هەزار خێزانی زەندیشی بە زۆر راگوێست و لەخاکی کوردستان نیشتەجێی کردن.

دوای ماوەیەك کە حەسەنعەلی خان لە شەڕ و کوشتاری سەلیم پاشای باباندا تووشی شکست هات و

سوپا و حەشیمەتی دەوروبەری بلاوەیان کرد، کەریم خان هەوای تۆلەسەندنەوە لەسەری دا و بە ئامانجی شەڕی حەسەن عەلی خان، سوپایەکی بێ هەژماری پێکەوە نا و [بەرەو سنە] کەوتە ڕێ. "ابراهیم بەگی وەکیل"(٧٧) ی کوردستان و هەندێکی تر لەگەورە پیاوانیش لەو ماوەیەدا، دڵیان لەحەسەن عەلی خان ئێشابوو، لەگەڵ هوردووی کەریم خان کەوتن.

ئیمام قولی خان"(٧٨) ی زەنگەنەش کەپێشتر بەحیسابی دراوسێیەتی [ئەردەڵان]، جەزرەبە و ئازار و زیان و زەرەری زۆر و شکست و بەردەست بوونی لەحەسەن عەلی خان دیتبوو و ئەوپەڕی ڕەقەبەری لەگەڵیدا هەبوو، دەرفەتی تۆلەسەندنەوەی بۆ هەلکەوت و بە لەشکری کرماشانەوە لەگەڵ هۆردووی کەریم خان کەوت و لە پێناو دەرکردن و لەناوبردنی حەسەن عەلی خاندا بوو بە هاودەست و هاوپەیمانی کەریم خان.

حەسەن عەلی خان، کەتوانای وەستانی لەخۆیدا نەدەدی، تکاکاری نارد و گوتی ئامادەیە خوشکی خۆی لەکەریم خان مارە کات و کۆتایی بە شەڕ و کوشتار بێنێ. بەلام کەریم خان قەبوولی نەکرد و ڕووی کردە سنە. حەسەنعەل خان هەلات و لەگوندی "قەرە تەوەرە" لەسەر سنووری نیوان کوردستان [ی سنە] و گەڕووس و

هەوشار کە ئەودەم قەلایەکی قایمی هەبوو، خۆی مەلاس دا. کەریم خان، "شێخ عەلی خانی زەند" ی کردە مەئموور بۆ ئەوەی گەمارۆی قەلاکە بدات، بەلام هیچی پێ نەکرا و قەلاکەی بۆ نەکرایەوە، ئێنجا بێ هیوا و زیان پێ گەیشتوو، گەڕایەوە دواوە.

لەلایەکی ترەوە کەریم خان، دوای کوشتن و وێران کردن و تالان و خراپەکاری لە سنە، هەموو شارەکەی لەمزگەوت و مەدرەسە و مال، چۆل کرد و ئاگری تێ بەردان. لەو بنەماڵە "زەندی" یانەش کە کۆچ درابوون، ئەوانەی وا ناسراو و دەولەمەند بوون ناردنیەوە بۆ ناو عێلی زەند و نزیکەی سەد و پەنجا خێزانیش لەبەر هەژاری و نەداریی لەکوردستان مانەوە. هەرئەوانە، ئەمڕۆ ماونەتەوە و زگ وزایان کردوە، بەچەشنێك کە ئێستا نزیکەی چوار سەد خێزان دەبن و لەو ئاوایيانەدا کە ناویان برا، نیشتەجێن و خەریکی ئیش وکاری رەعیەتین.

## مەتڵەبی شەشەم

### باسی ئەو هۆزانەی وا [پیتی] یەکەمی ناویان "س" ە

**یەکەم ـ سنگوڕ**

ئەم هۆزە، ئێستا نزیکەی پەنجا خێزانێك دەبن کە بەشێکیان لە گوندی "نیاز" و بەشێکی دیکەیان لە ئاواییگەلی دیکەی "ئێلاخ" نیشتەجێن. پێشتر دەوارنشین بوون و بەهار و هاوین لە ناوچەی "ئێلاخ" ی کوردستان و پایز و زستان لەلای "زەهاو" مەڕ و ماڵاتیان دەلەوەڕاند. ئەم پەنجا خێزانە بەمەزندە دوو سەد نەفەرێك دەبن و هۆی دانانی ناوەکەیان روون نییە، هەروەها کەسی ناوبەدەرەوەیان لێ هەڵ نەکەوتوە و کوێخا و مەزنێکی مەعلوومیان نیە.

**دووهەم ـ سوور سوور**

ئەم هۆزە لەسەردەمی پادشاهی خوالێخۆشبوو "شا سوڵتان حوسەین" [ی سەفەوی] دا، لەگەڵ "تەیموور بەگ" لە "کۆم" و "غیاب" ی خۆراسانەوە بە ئەمری شای رەحمەتی هاتوونەتە کوردستان و ماوەیەك هاوینە هەواریان خستۆتە مەریوان و بۆ پایز و زستانیش

چوونەتە شارەزوور و لەوێ ماونەتەوە، لەحەشیمەت و دەست و پێوەندی " ئیبراهیم بەگی وەکیلی کوردستان" بوون و پاشان بەحوکمی حاکمی کوردستان، لەمەریوان راگویزراون و ئاوایپگەلی «مامەند»، «بلوجە»، «ئاسنگەران»(٨١)، «مرواری»، «ئەختەخان»، «ترازولە»، «پشت حەنەك»، «وشترمل»، «مەیدانە»، «ئاساوڵە»(٨٢)، «هەپوشان»، «کە چەڵە»، «کاوشان» و «تانیە»... وهتد بۆتە هەوارگەی بەهار و هاوینیان. لەناوەڕاستەکانی پایز و زستانیشدا، وەك پاشماوەی هۆزەکانی کوردستان چوونەتە گەرمێنی زەهاو و لەوێ مەڕ و مالاتیان لەوەڕاندوە.

لەسەردەمی حکوومەتی والی خوالێخۆشبوو "امان الله خانی یەکەم" دا، چوونی زەهاویان لێ یاساخ کراوە ولەو گوندانەی سەرەوەدا نیشتەجێ کراون. هۆزەکە، ئێستا بوە بە دووبەشەوە: یەکیان بەهەمان ناوی "سوور سوور" ەوە ناو دەبرێ بەلام ئەوی دیکەیان بە "شێخەسورخابی" دەناسرێ. کوێخای ئێستای تاقمی سور سوور، "کووچك سوڵتان" و قەیخای شێخە سورخابییەکان، "سولەیمان سوڵتان" ە، کە بەپێی داب و رەسمی خۆیان بە کوێخا دەڵێن سوڵتان.

هەر دوو تاقمەکە [بەسەریەکەوە] دووسەد خێزانێك

دەبن کە هەندێکیان لەملکی ڕێزدار «امان اللە خانی وەکیل»(٨٣) و هەندێکی دیکەیان لە ئاواییگەلی ناوبراو دا نیشتەجێن. لە بەهار و هاویندا، ئەوانەی وا خاوەنی مەڕ و مانگای زۆرن، هەر لەو هاوینە هەوارانەی خۆیان کە ناومان بردن، بەشێوەی دەوارنشینی و کوێستانچیەتی دەمێننەوە.

هۆی ناونران: چۆن دووسی کەس لە باو و باپیرانیان سوورفل بون، ئەمانیش بە «سوور سوور» ناویان دەرکردوە، تاقمی "شێخ سورخابی" ش چون لەبنەچەکی "شێخە" ناوی کوڕی سورخاب بوون، بە شێخە سورخابی ناوبراون. کەسێکی ناوداریان لێ هەڵ نەکەوتوە.

## مەتڵەبی حەوتەم

باسی ئەو هۆزانەی کە پیتی یەکەمی [ناو] یان، پیتی «ش » ە

**یەکەم ـ شاقوبادی**

ئەم هۆزە، بەشێکن لە عەشیرەتی «زەردوویی» کەپێشتر باسیان لێوە کرا. هۆی ناونران: لەبەرئەوەی

«شاقوباد» ناوێك كوێخا و گەورەیان بوە، ئەوناوەیان پێ دراوە. دە تا بیست خێزانێكیان كە نزیكەی شەست - حەفتا كەس دەبن، لە خاكی جوانڕۆ لە مەحاڵی كوردستانی ئێران ماون و تائێستا كەسێكی بەناوبانگیان لێ هەڵنەكەوتوە.

**دووهەم - شامەنسووری**

بەشێكن لە هۆزی «كرِكرِه»، كەدواتر باسیان لێ دەكرێ. ئێستا، دە-دوازدە خێزانیان لەناو «كركەیی»[گورگەیی] دا، ماونەتەوە و دەبێ چل-پەنجا كەسێك ببن. بەهار و هاوینان لە گوندی «ئیمام» و «كوردمیران» لە ناوچەی «ئێلاخ» ی كوردستانی ئێران، خەریكی ئاژەڵداری و كشت وكاڵن و چەند خێزانێكیان لە «كولیایی» دەژین. بەپایز و زستانیش لەگەڵ پاشماوەی عێلاتدا، هەواریان دەخەنە لای «زەهاو». كوێخای ئێستایان«نەبی» ناوێكە، كە كوێخای «كرِكرِەییەكان» یشە. هەتا ئێستا، كەسێكی خاوەن ناوو ئیعتیباریان لێ هەڵنەكەوتوە.

**سێهەم - شێخ ئیسماعیلی**

لەسەردەمی پادشایەتی خاقانی بەهەشتی «فەتح عەلیشا»دا(٨٤)، خودا بەرگی نووری لەبەر كات، خوداڵێخۆشبوو «حاجی میرزا ئەحمەدی كوردستانی»، كە

ئەودەم لە پێتەختی تاران- خوا لەکارەساتی بپارێزێ دارۆغەی دەفتەر بوو، گوندی "دیهەج" ی لەناوچەی اسفند ئاباد کڕیوە و بەدڵنەوایی کردن ئەم هۆزەی لەلای "کلدو و ئاودە" وە کە عاید بە بەغدان، هێناوەتە کوردستان و لەم گوندە مەزرا و لەوەڕگەی پێ داون. [ئەوانیش] بەبەهار و هاوین لەوێ مەڕ و ماڵاتیان لەوەڕاندوە و بۆ پایز و زستان بەشێکیان چوون بۆ گەرمێنی لوڕستان و لە بەشێکی تریشیان لە زەهاب هەوار دەخەن.

ئێستاش، گوندی ناوبراو لەمیراتگرەکانی خوالێخۆشبوو میرزا ئەحمەدەوە گەیشتۆتە دەستی پایەبەرزی لە خاقان نزیك - "میرزا عەلی نەقی" سەررشتەدار و لەشکرنووس. هۆزەکە بەهاران و هاوینان هەر لەوێیە و دوو کەیخودایان هەیە: «قەیخامراد» و «قەیخا حوسەین عەلی». ژمارەی خێزانیان بەمەزندە سەد و پەنجایە و نزیکەی چوار سەد کەس دەبن.

هۆی دانرانی ناوی شێخ ئیسماعیلی ئەوەیە کە ئەو کاتەی لەخاکی عوسمانی دادەنیشتن، شوانکارەی "شێخ ئیسماعیلی بەرزنجی "بوون و هۆزەکەش بە ناوی ئەوەوە نیسبەت دراون و شێخ ئیسماعیلی یان پێ گوتوون. شێخ ئیسماعیلی بەرزنجیش کەسێکی ناسراو و لە زومرەی مەشایخ و عارفان دەژمێردرێ. بەشێك لە هۆزەکە هەر

لەلای بەغدا ماونەتەوە و بەشێکیشیان لە سلێمانی و شارەزور چوونەتە ناو عێلی جافەوە.

## مەتڵەبی هەشتەم

باسی ئەو هۆزانەی وا [پیتی] یەکەمی ناویان "ق" ە

**یەکەم ـ قالقالی**

ئەم هۆزە، بەشێکن لەعێلی "گەڵباخی" کە چۆنیەتی و ژمارەیان دواتر دەنووسرێ و لە رابوردودا لەگەڵ "گەڵباخی"یەکان پایز و زستان چوونەتە شارەزوور و لە بەهار و هاویندا مەڕ و ماڵاتیان لەکوردستانی ئێران لەوەڕاندوە، تا ئەو کاتەی کە لەسەردەمی امان الله خانی یەکەم، والی ناوچەی کوردستاندا و بەحوکمی ئەو لە ئاوابیگەلی " حاجی موسا" و "گڵە سوور" و "دێ سوور" و "شیخ حەیدەر" و "دەباغ" و... هتد نیشتەجێ کران و چوونیان بۆ شارەزوور یاساخ کرا .

بەڵام بەشێکیان هێشتا بەهار و هاوین لە هاوینەهەواری نزیك گوندە ناوبراوەکان خێوەت هەڵدەدەن و هەندێکی دیکەیان چوار وەرزە لە گوندەکاندا ماونەتەوە و ناجوولێنەوە واتە خێوەت نشینییان بەیەکجاری وەلاناوە.

کوێخایان لە گوندی "هاجی مووسا"، "کوێخا مەلیك" و هەروەها لە "کیلە سوور" و "دێ سوور" «قەیخا مەردان»ە. هۆی ناونرانیان ئەوەیە لەبەر ئەوەی زۆر قسە دەکەن و بە دەنگی بەرزیش دەدوێن، پێیان گوتوون "قالقالی"؛ لە دابی کوردەواریدا «قالقالی» بەو کەسانە دەڵێن کە فرەوێژ ودریژدادڕن.

**دووهەم ـ قوبادی**

ئێستا نزیکەی دووسەد خێزان و هەزار کەسێك دەبن، لە وەچەی "کاکە جان" ناوێکن کە خۆی بە تۆرەمەی خالیدی کوڕی وەلید دەزانێ و بەدوورەپەرێزی و لە خوداترسی ناوی دەرکردوە و گوایە لە ئەسڵی عەرەبەوە هاتوە. هۆزەکە، تۆرەمەی قوباد ناوێکن کە عەسکەری کاکە جانی ناوبراو بوە و بەهۆی ئەوەوە بە "قوبادی" ناسراون. سەرۆکی هۆزەکە و چەند هۆزی خێوەت نشینی تر لە ناوچەی جوانڕۆ، ئێستا "حەبیب بەگ" ێکە، کە پێشتر باسی لێوە کرا.

لەوەڕگە و مەزرای ئەم هۆزە لە بەهار و هاوین، مەزرای "بازان" و "نەهراب" ی جوانڕۆیە و پایز و زستانیش بۆ لەوەڕاندنی مالاٚت دەچنە پشت شاخی "شێخان" و خاکی زەهاو.

لەم هۆزە، کەسانی ناسراو بە ئازایەتی و پیاوەتی هەڵکەوتوون. یەکیان، "ئەحمەدبەگ" ناوێکە کە تا ئێستاش لەناو عێلاتی کوردستاندا بە ئازایەتی و بە جەرگی ناوی دەبرێ.

**سێهەم ـ قەشە**

لەسەردەمی زۆر زوودا، باپیران و پێشینیانیان مەسیحی بوون و وکەوتوونەتە شوێن قسەی قەشەکەیان، ئینجا ناوی "قەشە" یان پێ دراوە بەڵام دواتر، شەرەفی موسوڵمان بوونیان پێ بەخشراوە.

ئەم هۆزەش، رەعیەتی جوانرۆن، هەندێکیان ئێستا لەخاکی کرماشان و بەشێکی دیکەیان لەشارەزور و سلێمانی دادەنیشن. نزیکەی پەنجا خێزانێکیشیان لەخاکی جوانرۆ ماونەتەوە کە بەمەزندە دووسەدکەس دەبن. لەوەرگەی ئاژەڵیان لەوەرزی بەهار و هاویندا، کوێستانی "ویراس" و "ویرەنیان" ە. پایز و زستان دەچنە "روان" و "ئەنجرەك" لەخاکی جوانرۆ و نزیك "سیروان". کوێخایەکی بەپایە و رێز وکەسێکی ناوداریان نییە.

# مەتڵەبی نۆهەم

باسی ئەو هۆزانەی کە پیتی یەکەمی ناویان " ك" [و "گ"] ە

**یەکەم - کورکەیی**

ئێستا، لەخاکی کوردستان نزیکەی سەد خێزانێکن و بەشێکیشیان لەناوچەی کولیایی و "سونقوڕ" دەژین. پێشتر، لەوەرگە و،مەزرای بەهار و هاوینیان لەخاکی کوردستان بوە و بۆ پایز و بەهار چوونەتە گەرمێنی زەهاو. بەڵام چەند ساڵێکە کۆچی گەرمێنیان وەستاندوە ولە ئاوایی‌گەلی "سیلسیلە" و "زێویە" ی عاید بە ناوچەی "ئێلاخ" ی کوردستان نیشتەجێ بوون وپایز و زستانیش لەوگوندانە دا کە ناومان هێنان دەمێننەوە، بۆ بەهار و هاوینیش هەواریان لەدەوروبەری هەر ئەو گوندانە دەخەن و ئاژەڵ دەلەوەڕێنن.

قەیخای ئێستایان کوێخا "نەبی" ناوێکە و تائێستا کەسێکی بەناوبانگیان لێ هەڵنەکەوتوە. هۆی ناونران: چون بزنی زۆریان بوە و کورك - واتە مەرەزیان فرۆشتوە،ناوی "کورکە"یی یان لێ نراوە.

**دووهەم ـ هۆزی کەشکی**

نزیکەی ٢٥٠ خێزان و بەمەزندە، سەد هەزار کەس [دڵنیام هەڵەیە و دەبێ هەزار یاخود سێ هەزار بێت] بەنیر و مێ و گەورە و بچووکەوە دەبن. پایزو زستان لەهەندێ [ناوچەی] گەرمێنی " زەهاو" و لورستان هەوار دەخەن و مەڕ و ماڵات دەلەوەڕێنن. بەهار و هاوینانیش، بەندی "فەراجان" و "روانسەر" و کامیاران دەبێتە هەوارگەیان وبە مەڕ و ماڵات لەوەڕاندن و کشت و کاڵ ژیان دەبەنە سەر.

مەزن و کوێخای ئێستایان بەکردەوە، "فەتحوڵڵا بەگ" ە ولەبەر ئەوەی لە دۆی ئاژەڵ کەشکێکی زۆر دەگرن و لە شوێنی تر دەیفرۆشن، بە کەشکی ناسراون. هەتا ئێستا کەسێکی ناوبەدەرەوە و ناسراوی هەڵکەوتوویان نەبوە.

**سێهەم ـ هۆزی کەلاشی(٨٦)**

نیوەی ئەم تایفەیە ئێستا گوندنشینە و لە ئاواییگەلی "دلومەم" و "بێخوی" و "قەلا" ی جوانڕۆ و «تەرخان ئاوا» ناو(٨٧)، نیشتەجێن و نیوەکەی تریان دەوارنشینن. پایز و زستان لەگەڵ رەعیەتی باوەجانیدا، لەلای زەهاو مەڕ و ماڵات دەلەوەڕێنن، بەهار و هاوینیش لەسەردەسیر و کوێستانی "ماکوان" دەبەنە سەر. کشت و کاڵ و باخاتیان

لەگـــوندی "تەرخـــان ئاوا" ی عـــایـد بە جـــوانڕۆیە. ژمارەیەکیشیان لەخاکی کرماشان و شارەزوور و... هتد پەڕەوازەن.

دەوارنشـینەکانی ئەم هۆزە، ئێـستا نزیکەی شـەست خێزانێك دەبن و دووسەد و پەنجا کەسێك دەگرنەوە. زانا و پیـاوخـاسـێکی زۆر لەم هۆزە هەڵکەوتوە، کـە لە ناوچەکانی جوانڕۆ و هتد... خـەریکی دەرس گوتنەوە و خوتبەبێژی و پێش نوێژی بوون. ئێستاش "مەلا ئەحمەدی مـەلا باشـی" کە بەرپرسی مـەوقـووفاتی کـوردسـتـانە، لەم هۆزەیە. هۆی ناونران: گوندەکانیان راوگە و نێچیرگەی چاکن و کاتێ یەکی لە حاکمانی کوردستان لە زستاندا بۆ رۆژێك لەوێ مـاوەتەوە، بۆ بەرچایی و شـێو، چێشـتـیان لەگۆشتی مەڕەکێوی و بزنەکێوی بۆ ئامادە کردوە، مەڕە کـێـویش بەزمـانی کـوردی پێی دەگـوترێ "کـەڵ" و بەو بۆنەیەوە بە «کەڵ ئاش» ناویان دەرکردوە.

### چوارەم ـ هۆزی گەڵباخی

لەسـەردەمی شـایەتی بەهەشـتی "شـاە تەهمـاسب" ی سـەفـەویدا(٨٨)، لە قـەڵاچوالانی سلێـمانییـەوە هاتوونەتە کـوردسـتـانی ئێران. پیـاوانی ناوداریان لەشـاری سنە نیشـتـەجێ بوون و خـەریکی خـزمـەتکاریی و نۆکـەرایەتی

حاکمانی کوردستان و گەورە پیاوانی وڵات بون، بەشێکی زۆریشیان کەسب و کاریان کردوە. ئەوانی دیکەش بەهەوارچییەتی بەهار و هاوین لەکوێستان و زۆزانی کوردستان [سنە] و پایز و زستانیش لەمەحاڵی شارەزوور ماونەتەوە و ئاژەڵیان بەخێو کردوە.

نزیکەی بیست ساڵێك لەمەوپێش(٨٩) لەگەڵ عێلی جاف کەوتوونەتە شەڕێکی توندەوە و چەند کەس لە هەر دوو لایان کوژراوە. لەوکاتە بەدواوە، بەهۆی دوژمنایەتی عێلی جافەوە، ئیتر نەچوونەتە شارەزوور و پایز و زستان لەهەندێ گوندی کوردستان وەك "کێلەکەبوود"(٩٠) و "کتك" و "مەڕە" و "یاپل" و "روخەنجەرە" و"کانی سپی" و "ابراهیم ئاباد" و "کۆس عومەر" و "زەڕینە" و... هتد دا، خانووبەرەیان دروست کردوە و بە شێوەی نیشتەجێیی دەژین و لە ئێلاخاتی ئەو ناوچانە و شوێنی تر خەریکی ئاژەڵدارین.

ئەوانەی ئێستاش لە شێوەی خێوەت نشینیدا ماونەتەوە، نزیك بە ٥٠٠ خێزان و بە نیرومێ و گەورە و گچکەوە، سێ هەزار کەس دەبن. هەر چەند خێزانەی کوێخای خۆیان هەیە، بەڵام گەورەی هەموو کوێخاکان دووکەسن: " قەیخا حەسەن" و "قەیخا خەسرەو". تائێستا ناوی کەسێکی ناوداری وامان لەو هۆزە نەبیستوە کە

شـــایانـی باس بێت. هۆزی "وەرمــزیار" یش بەشـــێك لـەم عـێلـەیە و هەر بەوان دا دەنرێ(٩١). هۆی ناونـرانیـشـیـان ئاشکرا نییە.(٩٢)

**پێنجەم - هۆزی کەڵهوڕ(٩٢)**

نزیکەی دوسەد خێزان و بەمەزندە هەزار کەس دەبن. لەناوچەی سـەقـز، بەشـێـوەی دەوارنـشـیـنی دەژین و لە ئاوایيگەلی سـەقز دا گـەرمـێن و کوێستان دەکەن. نزیك بەسەد خێزانێکیشیان چەند ساڵێکە دەستیان لەخێوەت نشینی هەڵگرتوە و لە ئاوایی «رۆستەمان» و قشلاخەکانی رۆسـتـەمان - سـەربە مـەحاڵی خۆڕ خوڕە کە ناوچەیەکی کوردستانی ئێرانە، نیشتەجێ بوون.

لەناو ئەم تایفەیە- ئەوانەی وا دانیشتووی کوردستانی ئێرانن، کەسێکی ناسراو و ناودار هەڵنەکەوتووە "مـیرزا" ناوێك نەبێ کـەلە شـەڕی نێـوان خـوسرەوخـانی حـاکـمی کـوردســتــان و "ئەڵلاقـوڵی خـانی زەنگەنە"- حـاکـمی کرماشاندا، ئەڵلاقولی خانی کوشتوە و ناوی کەوتۆتە سەر زمانی خەڵك.

ئەم تایفـەیە، لقـێکن لەهۆزی کـەلهـوڕی "ئەیوان" کـە زێدیان خـاکی "دارالدولە" ی کـرمـاشـانە. لەکـۆتاییـەکـانی پادشاهی سـەفەویدا(٩٤) کاتێ حەسـەنعەلی خان حوکماتی

[ئەردەڵانی] دەکرد، ابراهیم بەگی وەکیلی کوردستان(٩٥) رێنوێنی ئەم هۆزەی کرد و هێنانیە خاکی کوردستان، مەزرا و لەوەرگەی دانێ و کردنیە رەعیەتی کوردستان. هۆی دانرانی ناو، بە چەشنێك کە خۆیان دەڵێن، ئەوەیە: نەوە و نەتیجەی "حر" ی شەهیدن و وشەکە، لەزمانی کوردی دا، تووشی گۆڕانکاری هاتوە و بۆتە کەڵهوڕ، خوا زاناترە.

### شەشەم ـ هۆزی گۆران(٩٦)

هەندێکیان ئێستا لەشاری سنە نیشتەجێن و زۆربەی بازرگان و پیشەساز و کاسبی شارەکە، لەو هۆزەن. دانیشتوانی ناوچەگەلی «هەورامان» و «ژاوەرۆ» و "گاوەرۆ" و "پلێنگان" یش، لقی ئەوانن. زانا و خواناس و پارێزکار و لەخواترسی ئەم هۆزە لە هەموو هۆزێکی دیکەی کورد زیاترن، وەك خوالێخوش بووی تاعەت قەبووڵ(٩٧)، «حاجی مەولانا ئەحمەد»، کە لە سەرەتای مانگی سەفەردا کۆچی دوایی کرد، لە تایفەی گۆران و بەحەق لەزانستی مەعقوول و مەنقوول و خواناسی و پارێزکارییدا لە ژوور هەموو عالمانی کوردی ئەم سەردەمەوە بوو. ناوبراو، لەناو عالمانی ئەم رووپەڕانەدا، بۆ فەتوای ئیش وکاری شەرعی و جامیع بوونی زانست، جێگای گومان نەبوو.

[هۆزی گۆران] دەبێ نزیکەی دوو هەزار خێزانێك بن کەدە هەزار کەسێك بگرێتەوە. ماوەیەکی دوور و درێژە خیلایەتییان وەلا ناوە و گوند و شارنشینیان هەڵبژاردوە مەگەر ژمارەیەکی کەمیان کەنیشتەجێی گوندن و بۆ ئاژەڵ لەوەڕاندن لە بەهارەوە تا دوو مانگ لە هاوین، لەماڵ دەچنەدەرێ و لەدەور و پشتی ئاواییەکەیان سێ مانگێك دەمێننەوە و ئینجا دەگەڕینەوە ماڵێ خۆیان.

پێش ئەوەی تایفەی ئەردەلانی لەکوردستان دا دەسەلات بستێنن، سەرۆك و مەزنی ئەم هۆزە لەناوچەی پلێنگان دانیشتوون،کە قەلایەکی سروشتی لێیە و دەست بەسەرداگرتنی زەحمەتە و دەوڵەت و ماڵێکیان هەبوە و زۆر عەشیرە و هۆز گوێ لەمستیان بوون [بەلام] دوای ئەوی خانانی ئەردەلان لەکورستاندا هێزیان گرت، دەستی گەورە پیاوان [ی گۆران] لەدەسەلات کورت کرایەوە.

لەهۆزی گۆران ژمارەیەکی زۆریشیان لەخاکی "دارا الدوله" ی کرماشان نیشتەجێن.

**حەوتەم ـ هۆزی کۆیك(٩٨)**

هۆی دانرانی ناویان ئاشکرا نییە، نزیکەی سەد و پەنجا خێزان دەبن کە ڕەنگە شەش سەد کەسێك بگرێتەوە. بەهار و هاوینان لەناوچەی ژاوەرۆ، مەحاڵی

"ئێلاخ" ی کوردستان مالات دەلەوەڕێنن و بەپایز و زستان لەگەرمەسێری ناوچەی ناوبراو هەوار دەخەن. روون نییە لەسەردەمی کام سولتاندا هاتوونەتە کوردستان ونازانرێ ئایا کەسێکی ناوداریان لێ هەلکەوتووە یان نا؟

**هەشتەم - تیرەی "کۆماسی"**

له "کوڕه وێز" که ناوچەیەکی کوردستانی ئێرانە، دەژین و بەمەزندە نزیکەی دووسەد خێزان دەبن کە هەزار نەفەر دەگرێتەوە. بەهارو هاوین لە ئێلاخاتی ناوچەی ناوبراو و پایزو زستان لەگەرمەسێری هەمان ناوچەدا هەوار دەخەن. لەزەمانێکی زووەوە شوێن و زێدیان هێناوەتە کوردستانی ئێرآن و لەسەردەمی شایەتی جێگای پەنا- شاعەبباسی سەفەوی و لە ڕۆژانی حکوومەتی خوالێخۆشبوو «هەلۆخان» ی(١٠٠) بنی اردلان دا ، له ئێران هەلاتوون و چوونەتە ناو دوو هۆزی " شوان"(١٠١) و شێخ بەزینی(١٠٢) و لە نێوان کەرکووك و حەریردا گەرمێن کوێستان دەکەن.

ماوەیەك لەوێ ژیاون تا لەسەردەمی حکوومەتی خان ئەحمەدخانی بەنی- ئەردەلان و پادشاهیی "شێخ صەفی"دا(١٠٣)، کە خان ئەحمەد خان هێز و دەسەلاتی بەسەر ولاتی مووسل و حەریر و کەرکوکدا گرت،

سەرلەنوێ رایگوێستن و هاوردنیەوە سەر جێ و مەکانی ئەسڵی خۆیان و لەوکاتەوە تا ئێستا لەهەمان شوێن - کەناوی "کورەوێز"ە دەژین.

کەسێکی ناسراویان لەناو هەڵکەتبێ، «مستەفا» نوێك بوە کە کەریم خانی زەند پێش ئەوەی بە روتبەی ئەمیریی و وەکیلی بگات، لەگەڵ ئەو و سی چل سواری زەند و کۆماسیدا لە کوێستانەکانی کوردستان خەریکی چەتەگەریی بوو. مستەفا لەگەڵ کەریم خان پەیمانی برایەتی بەستبوو و لەناو خۆیاندا وایان دانابوو کە هەرچی لەرێی دزی و ڕێگرییەوە پەیدای بکەن، نیوەی هی کەریم خان و نیوەکەی تری هی مستەفا بێت - کە ئەودەم کوێخایەتی هۆزی ناوبراوی بەدەستەوە بوو.

ماوەیەك ئەم کارەیان کرد تا جارێکیان کاروانێك دەڕووتێننەوە و دەیانەوێ بەنیوەیی بەشی کەن. گوێدرێژێك تاق دەکەوێ و بۆیان بەش ناکرێ، کەریم خان دەڵێ ئەو گوێدرێژە من هەڵیدەگرم، نیوەکەی واتە دوو لاقی بەقەرز لەسەر من بمێنێ. پاشان کە ماڵی دزی و تاڵانیمان وەگیرکەوت، لەشوێنێکی تر بۆت قەرەبوو دەکەمەوە.

کوێخا مستەفا قەبوڵی دەکات بەڵام چارەنووس وا دەبێ کە کەریم خان پێش ئەوەی قەرزی دوولاقی

گۆێدرێژەکە بداتەوە، دەگەڕێتەوە بۆ [گوندی] پەریە کە زێدی عێلی زەندە و دوای ماوەیەك، بە پێی ئالوگۆڕی ڕۆژگار، بە ئەمیریی و وەکیلی دەگات و لە "شیراز" دادەنیشێ.

هەواڵی کارەکە دەگاتە گوێی مستەفا و ئەویش بە هەوای برادەریی و دۆستییەکەی پێشوویان بڕیار دەدا بچێتە شیراز. دوای گەیشتنە شیراز، بە هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆر لەڕۆژی "سلام عام" دا بە چۆغە و فەرەنجی و جل و بەرگی کوردییەوە دەچێتە لای کەریم خان و بەبێ سێ و دوو کردن لەلای دادەنیشێ. یەساوڵ و پاسەوان بەری پێ دەگرن و نیازیان دەبێ سزای بدە. بەلام کەریم خان دەڵی کەی هاتووی؟ دەڵێ چەند ڕۆژێکە هاتووم بەلام دەرگاوان و قەراوڵ نەیاندەهێشت بێم چاوم پێت بکەوی. دەڵێ بۆ هاتووی؟ لەوەلامدا دەڵێ بۆ وەرگرتنەوەی ئەو دوولاقەگوێدرێژە هاتووم کە پێش ئەوەی بمدەیەوە هەلاتی و ئەوا لێرە دەتدۆزمەوە! ئەویش دەڵێ ڕاستە و ئێستاش لەجیاتی قەرزەکە لێرە دانیشە و وەك جاران شەریکم بە، هەر ئیش و مەنسەبێکشت بوێ، دەتدەمێ.

مستەفا دەڵێ یەکەم ئاو هەوای سافی زێد وولاتی خۆم بەو ئەمیری و شایەتییەی تۆ ناگۆڕمەوە ودانانیشم، ئەرك ومەنسەبیشم ناوێ و خۆشم لێی نایە. کەریم خان دەڵێ

خەڵکی ئێران هەموو منەتبارن و پێشکەشی دەنێرن بۆ ئەوەی ئەرك و مەنسەبێکیان پێ بسپێرم، تۆ لەبەرچی وەلای دەنێی؟ مستەفا لەوەلامدا دەڵێ من منداڵ و نەوە و کەس و کاری خۆم خۆش دەوێ و هۆی چارە ڕەشی و کوشتن و ماڵ وێرانی و تالان کرانیان پێك ناهێنم. تۆ تێگەیشتنت نیە و پێت وایە ئەم حاڵ و وەزعەی بۆت هاتۆتە پێشێ و ئەو ئەمیری و شەوکەت و گەورەییەت تاکۆتایی تەمەن بۆ دەلوێ، بەڵام دڵنیابە دوای خۆت، منداڵ و نەوە و کەس و کارت دەکەونە هەژاری و هەلاکەتەوە وتووشی هەموو چەشنە رەنج و تۆڵە و هەموو شێوە ئەشکنجە و سەرکۆنەیەك دەبن.

بەکورتی، کەریم خان زۆر پێ دادەگرێ و دەیەوێ لای خۆی بهێڵێتەوە، بەڵام هیچ سودێك نابەخشێ و دوای ئەوەی لەگل دانەوە و ناردنەسەر ئەرك و مەنسەبی ناهومێد دەبێ فەرمان دەدات چەند سەر گوێدرێژی نایاب بدۆزنەوە و هەڵیان بژێرن و بۆی بێنن. ئینجا دەیاندا بەمستەفا و دەڵێ ئەوانەش لەبری ئەو دوو لاقەی وا پێت قەرزداربووم! پاشان چەند ڕۆژێکی ڕادەگرێ و دیاری و پێشکەش بۆ ژن و پیاوانی عێلەکەی دەنێرێ و بەڕێی دەکات.

هۆی دانرانی ناوی کۆماسی لەسەر هۆزەکە، بەچەشنێ

که خۆیان دەگێڕنەوە، ئەوەیە کاتێ خوالێخۆشبوو خان ئەحمەد خان حەواڵەی سوورو ساتی قشوون دەنێرێ بۆ وڵات. لەبەر ئەوەی ئەم هۆزە مانگا و مەڕێکی زۆریان هەبوە، حەواڵەی ماستیان دەداتێ ئەمانیش بارە ماستەکان دێنن و لە ناوەڕاستی هوردوەکەدا هەڵیان دەچنن. خان ئەحمدخان دێ و دەی بینێ و دەڵێ ئەمە کۆی ماستە! لەبەرئەوە بە «کۆماسی» ناسراو و ناودار بوون.

**نۆهەم ـ هۆزی کوکوئی**

سەرۆك و کەیخودای ئەم هۆزە، زۆر جاران لەبەگزادەی «ئێناخی» بوون. پێشتر تایفەیەکی زۆر بە پایە وڕێز بوون، بەڵام بەتێپەڕبوونی چەرخ و زەمانە لەبەریەك بڵاوەیان کردوە، هەندێکیان لەخاکی دەوڵەتی عوسمانی لە گوندەکاندا نیشتەجێ بوون و بەشێکی دیکەیان وەك جاری جاران لەناوعێلی جافدا بە دەوارنشینی ماونەتەوە و بوونەتە بەشێك لە عێلی جاف و لەگەڵ ئەواندا گەرمێن و کوێستان دەکەن.

ئێستا نزیکەی سی خێزانێکیان کە بریتی بێت لە سەد و پەنجا کەس، لەخاکی ناوچەی جوانرۆ عاید بە کوردستانی ئێران ماونەوە و بەهار و هاوین لە دووشوێن کە "ماکوان" و کۆیلە" یان پێ دەڵێن و پایز و زستان لە

